# تەجویدی شایان

## بۆ فێربونی قورئان




نووسین

محمدأمین ملا عبدالغفور

مۆڵەتپێدراوی حەفت جۆری خوێندنەوە

و زانستی رەسمی قورئان



چاپی یەکەم/یرشمش□ك – □یربریرم

**ناوی پەرتووك:** تەجویدی شایان بۆ فێربونی قورئان

**نووسین:** محمدأمین ملا عبدالغفور

**وەرگێران لەكرمانجی بو سورانی:** محمدصالح پێندرۆیی (جگەرسۆز)

**دیزاینی ناوەڕۆك:** نووسەر

**ژماری لاپەڕە:** نییر لاپەر

**ژماری سپاردن:** تیر / لهییر/ -D

**چاپی یەكەم/** یشمتر ك – تریبریم



**ئەم چاپە تایبەتە بە ڕێكخراوی إقرأ**

ڕێکخراوی اقرأ بۆ زانستەکانی قورئانی پیرۆز
منظمة اقرأ لعلوم القرآن الكريم

قال الله تعالى (عزّ وجلّ)

﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ 121﴾ سورة البقرة: ترير

(دەستەیەك لەوانەی کتێبمان پێبەخشیون بەچاکی و بەوردی دەوری دەکەنەوە، ئەوانە باوەڕیان پێی هەیەو باوەڕی پێ دەهێنن بەڵام ئەوەی بڕوای پێی نەبێت، ئا ئەو جۆرە کەسانە لە خەسارەتمەندو زەرەرمەندەکانن)(1).

قال رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

« بَلِّغُوا عَنِّي وَلَو ءايَة »(2)

پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت: لە منەوە بگەیەنن، ئەگەر ئایەتێکیش بێت.

---

(1) تەفسیری ئاسان, نووسینی مامۆستا بورهان محەمەدئەمین.

(2) رواه أحمد: (جير/صني لهتر) ؛ رواه البخاري:(جشم /صبربيتر)

## دياري (إهداء)

ئەم پەرتووكە پێشكەشە بە سەروەری مرۆڤايەتی محمد (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ), هەروەها دايك و باوك و هاوسەر و مامۆستاكانم, كە لەبەردەستيان فێری زانستی تەجويد و قيرائەتەكان بووم, بە تايبەتی (الشَّيخ الدكتور خالد عزيز الكورانی الموصلّی), (الشَّيخ عبد الجبار أحمد فتحی الحمدانی), هەروەها پێشكەش بە گشت قورانخوێنەكان و شەيدايانی زانستی تەجويد دەكەم.

هديةٌ إلى

دياري بۆ

تەجويدی شايان

بۆ فێربونی قورئان

# سوپاس

قالَ رَسُـولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « مَن أُوتِيَ إِلَيهِ مَعروفٌ فَلْيُكَافِئ بِهِ، فَمَنْ لَم يَسْـتَطِع فَلْيَذْكُرهُ، فَمَنْ ذَكَرَهُ فَقَدْ شَكَرَهُ » [١]

**سوپاسی یەكەم:** سەرەتا سوپاسی خوا دەكەم, كە تەوفیقی دام بۆ نووسینی ئەم پەرتووكە, بۆ ڕاڤەكردنی تەجویدی قورئانی پیرۆز.

**سوپاسی دووەم:** ئاراستەی دایك و باوكم دەكەم, هەروەها ئەو ماموٚستا و شێخانەش كە لەبەر دەستیان فێری خوێندنی قورئان و تەجوید بووم.

**سوپاسی سێیەم:** ئاراستەی خێزانم دەكەم, كە لە كاتی نووسینی ئەم كتێبە بۆ ماوەی دوو ساڵ, لەگەڵم پشوودرێژ بوو.

**سوپاسی چوارەم:** ئاراستەی (دكتور خالد عزيز إسماعيل) دەكەم، كە بابەتەكانی ئەم پەرتووكەی لە ڕووی زانستییەوە بەرز نرخاندووە، دوای ئەوەی بەشی زیاتری بابەتەكانی ئەم پەرتووكەی بۆ خوێندرایەوە و خرایەڕوو، هەروەها ئەركی نووسینی پێشەكیی ئەم پەرتووكەیشی بە زمانی عەرەبی گرتە ئەستۆی خۆی.

**سوپاسی پێنجەم:** ئاراستەی دكتۆر (أيمن رشدي سويد) دەكەم, كە ڕێگەی پێدام سوود لە وێنەی دەرچەی پیتەكانی ناو پەرتووكەكەی وەرگرم, بەناوی (التجويد المصور).

**سوپاسی شەشەم:** ئاراستەی ماموٚستا محمد صالح پێندرووبی (جگەرسۆز) دەكەم, بۆ وەرگێڕانی كتێبەكەم لە شێوەزاری كرمانجییەوە بۆ شێوەزاری سۆرانی.

داواكارین لە خوا, كە ئەم پەرتووكە بۆ هەمووومان بكاتە (صدقة جارية), هەروەها داوا لە گشت خوێنەرانیش دەكەم, كە لە نزای خێر بێبەشمان نەكەن.

والصلاة والسلام على محمد وعلى آل محمد

**نووسەر**

**محمدأمين ملا عبدالغفور**

---

(١) رواه أحمد: (ج  /صبرني) ؛ رواه أبو داوود: (ج ير/ صيرترير)

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحمد لله، والصلاة والسلام على سيدنا محمد رسول الله وآله وصحبه ومَن والاه، وبعد:

فإن أشرف ما يتقرب به العبد إلى الله تعالى الاشتغال بالقرآن الكريم المحفوظ؛ فهو كلام الله الذي ﴿لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ ٤٢﴾ (فُصِّلَت) ، وبيّن هذا قولُ النبيِّ ﷺ:«خيرُكم مَن تعلّم القرآن وعلّمه» (أخرجه البخاري)، وقد كانت عناية النّبيّ ﷺ بالقرآن في أعلى المراتب ولهذا كان ﷺ يحثُّ أصحابه ﷺ أن يأخذوا القرآن من القراء الموصوفين بأعلى مراتب الإتقان في القراءة فقال ﷺ: « استَقْرِئوا الْقُرْآنَ مِنْ أرْبَعَةٍ: مِن ابْنِ مَسْعُودٍ، وَسَالِمٍ مَوْلَى أبي حُذَيْفَةَ، وَأُبَيِّ بن كَعْبٍ، وَمُعَاذِ بن جَبَلٍ » (أخرجه مسلم)، وقال النبيُّ ﷺ لِأُبَيِّ بن كَعْبٍ: « إِنَّ اللهَ أمَرَنِي أنْ أقْرَأَ عَلَيْكَ: ﴿لَمۡ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ﴾، قال: وسَمَّانِي؟ قال: (نعَمْ). قال: فبَكَى» (متفق عليه)، وقد سأل الإمامُ عاصمٌ بنُ أبي النّجودِ الطفيلَ بنَ أُبَيِّ عن توجيه قراءة النبيّ ﷺ على أبيه فقال: يَقرأ عَلَيَّ فأحذوَ ألفاظه. وعلى هذا يكون معنى الحديث ومَغزاهُ أن يتعلَّم أُبيٌّ قراءة النبيّ ﷺ.

وقد تضافرت عبارات الأئمة الكبار ببذل الجهد من أجل مزيدٍ من الإتقان؛ ليرتقي القارئُ إلى مَصَافِّ الكرامِ البررة ومن ذلك قول الإمام ابن الجزري: (ولا أعلَمُ سبباً لبلوغ نهاية الإتقان والتجويد، ووصولِ غاية التصحيحِ والتشديد مِثلُ رياضةِ الألسُن، والتكرارِ على اللَّفظ المتلَقَّى من فمِ الـمُحسِن، وأنتَ ترى تجويدَ حروفِ الكتابة كيف يَبلغ الكاتب بالرياضة وتوقيفِ الأستاذ).

هذا وإن هذا الكتاب الموسوم بـ(تەجویدی شایان بۆ فێربونی قورئان) إذا التزم به قارئ القرآن ما فيه من بيان أحكام التجويد وطريقة الأداء فإنه سيرتقي في قراءته حتماً إلى مَصَافِّ القراء المتقنين بشرط أن يتلقّاها على يد شيخ ماهرٍ مُتقنٍ يرتقي به في رياضة الفكِّ واللسان،كيف لا؟! وقد قال الإمام ابنُ الجَزَري:

وَلَيسَ بَيْنَهُ وبَينَ تَرْكِهِ  إِلَّا رِيَاضَةُ امْرِئٍ بِفَكِّهِ

هذا وإن الأخ الشّيخ (محمدأمين ملاعبد الغفور) قد بذل جهداً مشكوراً في بيان جانب واسع من أحكام التجويد بلغتنا الكُردية مع مراعاة الدّقّة في انتقاء الكلمات وضبط العبارات ؛ لِيَسهُل على المتعلمين القراءة بإتقانٍ علماً وعملاً.. أسأل الله سبحانه له التوفيق ولمشايخنا ومشايخه ولكافة أهلِ العلمِ والمتعلمين والمؤمنين والمؤمنات، ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ٨﴾ (آل عمران)

وكتبه: د. خالد عزيز الكوراني الموصلي

المجاز بالقرءات العشر – ومختص في الرسم القرآني وتوجيه القراءات القرآنية

## پێشەکی

الحمد للّٰه رب العالمين والصّلاة والسّلام على أشرف الأنبياء وإمام المرسلين محمد وعلى آله وصحبه وسلّم أجمعين.

قورئانی پیرۆز سەرچاوەی گشت زانستە شەرعییەکانە، پەروەردگار بۆ ڕێنوێنی کردنی مرۆڤایەتی دایبەزاندووە، بۆیە خوێندنەوە و پابەندبوون بە یاساکانییەوە دەبێتە هۆی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی پەروەردگار و بەرزبوونەوەی پلەکانمان لە دنیا و قیامەتدا, هەروەك پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت (إن الله يرفع بهذا الكتاب أقواما ويضع به اخرين)[1] واتە: خوا بەم قورئانە, هەندێکیان سەردەخات و بەرز دەکاتەوە, هەندێکیشیان پەست و نزم دەکاتەوە.

بەڵام بۆ ئەوەی بتوانین قورئان بەشێوەیەکی ڕاست و دروست بخوێنینەوە و بەتەواوی لێی حاڵی بین, پاشان کاری پێ بکەین, پێویستە خۆمان فێری زانستی تەجوید بکەین, ئا بەو شێوەیە دەتوانین بە جوانی و دروستی قورئان بخوێنینەوە.

زانستی تەجوید, زانستەکی بەرفراوانە و لە پیرۆزترین زانستەکانە، چونکە پارێزگاریی لە دروست خوێندنەوەی قورئانی پیروز دەکات.

دوای ئەوەی پەروەردگار تەوفیقی دام، لە ڕێگای شێخ و مامۆستاکانم و کتێبەوە فێری خوێندنەوەی قورئان و زانستی تەجویدبووم, هەروەها دوای ئەزموونێکی دووروودرێژ و کردەیی لەگەڵ شرۆڤەکردن و بڵاوکردنەوەی زانستی تەجوید لە ڕێگەی خولی تەجوید و بەرنامە تەلەڤزیۆنی و ڕادیۆکانەوە, وەك ئەرکێکی ئایینی و لە ژێر فەرمانی پێغەمبەر(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ), کە دەفەرموێت: «بَلِّغوُا عَنِّي وَلَو ءايَة »[2], بەپێویستم زانی ئەو زانستەی کە بەدەستم هێناوە, لە دوو توێی پەرتووکێکدا, بەناوی (تەجویدی شایان بۆ فێربونی قورئان) بڵاوی بکەمەوە. لەم پەرتووکەدا تیشکم خستووەتە سەر زۆر بابەتی پەیوەست بە تەجوید, کە هەم خوێنەری سەرەتایی (مبتدأ) دەتوانێت سوودی لێوەربگرێت, هەمیش مامۆستا, چونکە بابەتگەلێکی وردی لەسەر تەجوید لەخۆگرتووە,کە مامۆستا بتوانێت بە شێوەیەکی ئاسان و پوخت سوودی لێوەربگرێت, هەروەها ئەم پەرتووکە ژمارەیەکی زۆری تێبینی و زانیاری سوودبەخشی تێدایە, دیسان ئەم پەرتووکەم بێبەش نەکردووە لە هەندێك زانیاریی بە زمانی عەرەبی, کە زمانی قورئانە، چونکە زۆر بابەت هەن, بە ناوە عەرەبییەکان ناونراون, هەروەك زانایانی سەردەمی یەکەم ناوزەدی کردوون.

---

( ) رواه أحمد: (جتر/ صلهلهسم/ حيرسمير) ؛ رواه مسلم: (جير/ صتربرير /حيترتي)

(يىر) رواه أحمد: (جير/صني لهتر) ؛ رواه البخاري:(جشم /صبريىتر)

هەڵبەت زۆر پەرتووكی دیكە لەسەر تەجوید نووسراون, بەڵام ئەم پەرتووكە جیاواز و دەگمەنە, چونكە بە زمانێكی ئاسان نووسراوە و دیزاینێكی جوان بۆ بابەتە فرەجۆرەكانی كراوە، هەروەها خشتە و هێمای ڕەنگاوڕەنگی تێدایە. دیسان پەرتووكەكە بەسەر شەش بەشدا دابەش كراوە, بۆ ئەوەی خوێنەر بەئاسانی بابەتەكانی بدۆزێتەوە و سوودی لێوەربگرێت, هەروەها ئەم پەرتووكە بە وێنەی دەرچەكان و سیفەتی پیتەكانی ناو پەرتووكی(التجوید المصور), دەوڵەمەند كراوە دوای ئەوەی كە مۆڵەتی فەرمیم لە خاوەنی پەرتوكەكە بەڕێز دكتور(أيمن رشدی سويد) وەرگرتووە, بۆ ئەوەی خوێنەر بەجوانی فێری زانستی تەجوید بێت. هەڵبەت ئەم پەرتووكە بەناوی (روناهی بۆ تەجویدەكا ب ساناهی), تا ئێستا دوو جار بە شێوەزاری كرمانجی چاپ كراوە و لەلایەن خوێنەرانی قورئانەوە پێشوازییەكی گەرمی لێكراوە, بۆیەش بە پێویستم زانی بەشێوەزاری سۆرانیش بڵاوی بكەمەوە, بۆ ئەوەی زۆرترین خەڵك سوودی لێوەربگرێت.

لە كۆتاییدا، داواكارین لە پەروەردگار, كە هەموو ئەم كارانە بۆ ئێمە بە خێرێكی نەبڕاوە هەژمار بكات و نیازمان پاك بكات و بەردەوامان بكات لەسەر كاری خێر و چاكە.

**تێبینی**: زۆربەی زانیارییەكانی ناو ئەم پەرتووكە, بەپێی ڕیوایەتی (حفص), بەڕێگای (**الشاطبية والتيسير**) نووسراون.

- ئەو نیشانانەی بەكارهاتوون:

﴿ ﴾ كەوانەی تایبەت بە ئایەتەكانی قورئان

« » كەوانەی تایبەت بە فەرموودەكانی پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

ج: بەرگی پەرتووكەكان(الجزء)

ص: لاپەڕ(الصَّفحة)

ح: ژمارەی فەرموودە (رقم الحديث)

××: نیشانەی شیكردنەوە لە پەراوێز

پەرتووك/ژمارەی دێڕەكە: هونراوەكانی تەجوید (المتون)

- زانیاریی تەواو لەسەر سەرچاوەكان, لە ناو لیستی سەرچاوەكاندا دەبینیت.
- زاراوەكانی تەجویدمان بە عەرەبی نووسیوە, هەندێك جاریش بە كوردی ڕاڤەمان كردووە.

نووسەر

محمدأمين ملا عبدالغفور

پر□□تر ك - ترپرپر

# بەشی یەكەم

- زانستی تەجوید ( علم التجوید )
- سەردەمی پەیدابوونی زانستی تەجوید
- تیڕوانینی زانایان بۆ زانستی تەجوید
- پوختەیەك لەژیانی ( ئیمام عاصم ) و ( ئیمام حفص )
- پاداشتی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز
- خۆڕەوشت و ئادابەكانی قورئا نخوێن
- هەڵە ( اللَّحن )
- خێرایەكانی خوێندنەوەی قورئان

# زانستی تەجوید

زانستی تەجوید, بە شێوەیەکی گشتی پەیوەستە بە خوێندنەوەی پیتەکانەوە، بەڵام لەگەڵ خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزدا, لەلایەن زانایانەوە گرنگییەکی زۆری پێدراوە, بۆئەوەی قورئان بە شێوەیەکی دروست بخوێندرێتەوە.

لە دەستپێکی هەر زانستێکدا, پێویستە دە خاڵ ڕەچاو بکەین, کە بوونەتە بناغەی بونیادنانی هەر زانستێك، زانستی تەجویدیش یەکێکە لەو زانستانە، أبو العرفان محمد بن علی الصبّان لەم چەند دێرە شیعرەدا ئاماژە بەو دە خاڵە دەکات و دەڵێت :

إنَّ مَبَادِئ كُلِ فَنٍّ عَشرَة  الحَدُ والمَوضوعُ ثُمَّ الثَّمَرة
وفَضْلُهُ ونِسْبَةٌ والواضِعْ  والاسْم الاسْتِمدادُ حُكْمُ الشَّارِعْ
مَسَائِلٌ والبَعضُ بالبَعْضِ اكْتَفَى  ومَنْ دَرَى الجميعَ حَازَ الشَّرَفَا (1)

- الحد: واتە پێناسەی زانستی تەجوید:

(التجوید) لەڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە باشکردن یان چاککردن(2).

لەڕووی زاراوەوە: خوێندنەوەی هەر پیتێك لە شوێنە ڕاستەکەی خۆی, لەگەڵ خوێندنەوەی سیفەتە پێویستەکان (الصِّفات اللازمة ) و سیفەتە کاتییەکان (الصِّفات العارضة ).

- الموضوع (بابەتەکانی): بریتییە لە خوێندنەوەیەکی دروست بۆ وشەکانی قورئانی پیرۆز.

- الثمرة: بەرهەمی فێربوونی تەجوید بریتییە لە پاراستنی زمان لە خوێندنەوەی هەڵە.

- فضلە: بە پیرۆزترین زانست هەژمار دەکرێت،چونکە قورئانی پیرۆزی پێ دەخوێندرێتەوە.

- نسبتە: تەجوید, یەکێکە لە زانستە شەرعییەکان, کە پەیوەستە بە قورئانی پیرۆزەوە.

- الواضع: پێغەمبەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)یەکەم کەس بووە, کە قوئانی پیروزی بەتەجوید لە جبریلەوە (عَلَيْهِ السَّلامُ) وەرگرتووە و خوێندووەتەوە, جبریلیش لە خواوە وەرگرتووە.

هەندێك زانا دەڵێن (أبو الاسول الدؤلي) یەکەم کەس بووە ئەو یاسایانەی داناوە و هەندەکیش ددەنە پاڵ (الخلیل بن أحمد الفراهیدي) و هەندەکیدیکەش ددەنە پاڵ (حفص بن عمرو الدوري) و هەندێکیش بۆ ئیمامەکانی قیرائەتەکان دەگەڕێننەوە.

~~ئێمەش دەڵێین هەر یەك لەم زانایانە ڕۆلی هەبوە لە دانانی یاساکانی ئەم زانستە.~~

(1) حاشیة الصَّبان على شرح الملوي الصغیرلسلمْ المنطق: (ص لهسم)  (2) مختار الصحاح: (مادة جود/ صنىشم)

- الاسم: تەجویدی قورئانی پیرۆز.
- الاستمداد: زانایانی قیرائەت, ئەم زانستەیان لە شوێنکەوتوو (تابعی) و هاوەڵ (سەحابە)ەکانەوە وەرگرتووە و ئەوانیش لە پێغەمبەرەوە(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وەریانگرتووە, ئینجا یەکێك بۆ یەکێکی دیکەی گواستوویانەتەوە, تا گەیشتووە بە ئێمە.
- حکم الشرع:لەڕووی زانیارییەوە(فرض الكفاية)ە،لەڕووی کارپێکردنەوە(فرض العين)ە.
- مسائله: زۆر بابەت و یاسا لەم زانستەدا دەخوێندرێن, وەك: (احكام المد، احكام النون الساكنة والتنوين، احكام الميم الساكنة ، .... هتد).

خوێندنەوەی قورئان و فێربوونی تەجوید, بە دوو ڕێگا وەردەگیرێت: (الرواية والدراية)

١- طريقة الرواية: قوتابی بۆ شێخەکە دەخوێنێتەوە, یاخود شێخەکە بۆ قوتابی دەخوێنێتەوە و شی دەکاتەوە, قوتابی دووبارەی دەکاتەوە.

٢- طريقة الدراية: قوتابی لە ڕێی بەرنامە و پەرتووکەوە, هەوڵ دەدات خۆی فێری تەجوید بکات و لەسەر قورئان کاری پێ بکات.

## هۆکاری خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بەتەجوید

١- چونکە خوا فەرمانی پێی کردووین کە قورئان بە تەجویدەوە بخوێنینەوە, هەروەك دەفەرمووێت: ﴿وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا﴾, واتای(ترتيلا)ش, هەروەك (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) شرۆڤەی دەکات و دەڵێت: (تجويد الحروف ومعرفة الوقوف)(1) واتە: تەجویدی پیتەکان و زانینی شوێنی دروست بۆ وەستان لەسەری.

٢- بۆ پاراستنی زمان لە هەڵە, لەکاتی خوێندنەوەی قورئان.

- بەکارهێنانی یاساکانی تەجوید، وەکوو: (إدغام، إخفاء، تسهيل .... هتد) بۆ ئاسانکردنی خوێدنەوەیە، بەڵام بە مەرجێك کاریگەریی لەسەر واتاکەی بەجێ نەهێڵێت.

٣- خوێندنەوەی قورئان بە تەجوید و بەدەنگێکی خۆش, هەستێکی خۆشی باوەڕ لای مرۆڤ پەیدا دەکات.

- خوێندنەوەی قورئان بە تەجوید, وا دەکات کە جیاواز بێت لە کتێب و شیعر و پەخشان.

---

(1) الاتقان في علوم القرآن:(ص١٠٦)

## سەردەمی پەیدابوونی زانستی تەجویدیْ

بێگومان قورئانی پیرۆز بە تەجویدەوە بۆ پێغەمبەر(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دابەزیوە و لەلایەن جبریلەوە (عَلَيْهِ السَّلَامُ) خوێندراوەتەوە. هەروەك لە چەندین فەرموودەدا هاتووە و وتەی هاوەڵانیش, خوایان لێ رازی بێت, بۆ ئێمەی دیاری کردووە, کەوا پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چۆن قورئانی پیرۆزی خوێندووەتەوە.

تر- عبداللە کوری مسعود, گوێی لە کەسێك بوو, ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا...﴾ بەلام پیتە مەددییەکانی دروست نەدەخوێندەوە، ئەویش وتی: پێغەمبەر بەم شێوەیە بۆ منی نەخوێندووەتەوە، پێی وت: ئەی چۆن بۆ تۆی خوێندووەتەوە؟ عبداللە بۆی خوێندەوە و مەددەکانیشی درێژ کردەوە (1).

یر- پرسیار لە (ئەنەسی کوڕی مالیك) کرا, ئاخۆ پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قورئانی چۆن دەخوێندەوە؟ ئەو وتی: درێژ دەخوێنیێتەوە, پاشان (بسم اللە)خوێندەوە و وتی: (بسم اللە)ی درێژ دەکردەوە و (الرّحمن)ی درێژ دەکردەوە و (الرّحیم)یشی درێژ دەکردەوە(2).

سم- پرسیار لە دایکی موسڵمانان(أم سلمة)کرا, ئایا پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چۆن قورئانی دەخوێندەوە؟ ئەو وتی:(كان يقطع قراءته آية آية)(3)واتە: لەسەر هەموو ئایەتەکان دەوەستا(4), هەروەها دایکی موسڵمانان (عائشة), خوا لێی رازی بێت, دەڵێت: (كان رسول اللە يقرأ السّورة فيرتلها حتي تكون أطول من أطول منها)(5) واتە: پێغەمبەر(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خوێندنەوەی خۆی درێژدەکردەوە, تاسورەتەکە لە سورەتانەکانی دیکە درێژتردەبۆوە.

لەم فەرموودانەدا دەردەکەوێت, کە تەجوید لەگەڵ قورئاندا دەخوێندرایەوە، بەلام لەسەردەمی پێغەمبەردا وەکوو زانستێکی جیاواز نەبووە، کە ئێمە ئێستا دەیخوێنین, چونکە عەرەبەکانی سەردەمی پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ), بەشی زیاتری یاساکانی تەجویدیان لەگەڵ خوێندنەوە و قسەکردنیاندا بەکاردەهێنا, هەروەها لەگەڵ خوێندنەوەی قورئانیش، بۆیە بە پێویستیان نەدەزانی ئەم یاسایانە بە شێوەی دەرس بخوێنن، بەلام دوای موسڵمانبوونی (عەجەمەکان, وەك: (کورد، ترك و فارس....هتد), زۆرێك لە زانایان دیتیان کە قورئان بە هەڵە دەخوێندرێتەوە و بەپێی یاساکانی زمانی عەرەبی ناخوێندرێتەوە, بۆیە هەستان بە نووسینەوەی ئەو یاساگەلانەی کە پەیوەستن بە خوێندنەوەی عەرەبییەوە, بە تایبەتی ئەوانەی پەیوەستن بە خوێندنەوەی قورئان, تاکوو لە هەڵە پارێزراو بێت.

---

(تر) المعجم الكبير: (ج ني /صبيسمتر) ؛ النشر( تر/ لهترسم - ترسم) (ير) رواه البخاري: (ج /ص لهيتر)

(سم) رواه أحمد: (ج /ص يربرسم)؛ الحاكم: (ير/يرسمير)؛ رواه أبو داود:(ثم/صبيسم)

(ثم) ل بەشیْ (الوقف والابتداء) تیشك دەخەینە سەر شوێنە دروستەکانی وەستان. (له)رواه مسلم: (ج تر/ صبيبر له)

**لەو زانایانە:**

یەکەم کەس کە دەرگای بۆ تەجوید کردبێتەوە (أبو الأسود الدؤلي ترب هـ-نی ه)بوو[1], کاتێك سەر و ژێر(الحرکات)ی بۆ پیتەکان داناون و دوای ئەویش(الخليل بن أحمد الفراهيدي بربرتر-بر تره) بوو, کە لەسەر دەرچەو و سیفەتی پیتەکانی نووسی, ئینجا (سيبويه أبو بشر عمرو بن عثمان (تيشمتر-برتيتر هـ) بوو, بابەتی لەسەر تەجوید نووسی, لە کۆتایی پەرتووکی (الكتاب)دا, کە لەسەر تێکهەڵکێشان(ئیدغام) و دەرچەو سیفەتی پیتەکان نووسیویەتی.

یەکەم زانا, کە بە شیعر لەسەر تەجویدی نووسی بێت (أبو مزاحم الخاقانی تيشمير-لهيرسمه)ە[2] لە پێنجا و یەك دێرەشیعردا, کە بە (الخاقانيه)ناسراوە.

دواتر زانایان زۆر پەرتووك و بابەت و هەڵبەستیان لەسەر ئەم زانستە نووسیوە, وەك: پەرتووکی (التَّنبيه على اللّحن الجلي واللَّحن الخفي), کە هی السَّعیدی علی بن جعفر(ت برترشمه). لە ئەندەلوسیش دوو پەرتووکی گەورە بڵاوکرانەوە, یەکەمیان (الرِّعاية)ە, کە هی (مكي بن أبي طالب القيسي (ت سمشه هـ))ە, ئینجا پەرتووکی (التَّحديد), کە هی أبي عمرو عثمان بن سعيد الدّاني(تشمشمه هـ)ە, پاشان لە هەمان چەرخدا, عبدالوهاب القُرطبي (ت تر شه هـ ), پەرتووکی(الموضّح في التجويد )ی نووسی.

هەندێك لەزانایان یاساکانی قیرائات بۆ ئێمە گواستووە, بەلام (أبو عبيد القاسم بن سَلّام (ت شميريرهـ) یەکەم کەس بوو, کە لە سەدەی سێیەمی کۆچیدا لە پەرتووکی (القـراءات)دا, لەسەر جۆرەکانی خوێندنەوەی نووسی, لە چەرخی چوارەمی کۆچیدا, زانای ناودار (أحمد بن مجاهد البغدادي(تشميرسمهـ)) یەکەم زانا بوو, پەرتووکێکی لەسەر حەوت جۆری خواندنەوەی نووسی, بەناوی (السّبعة في القراءات).

پاشان یەك لە دوای یەك پەرتووك لەسەر تەجوید و جورکانی خوێندن نووسران, تا گەیشتە ئیمامی شاطبي(القاسم بن فِيرُّه الشاطبي) و ئیمامی جەزەری (أبو الخير محمد بن يوسف الجزری), کە ئەم دووانە هەردووکیان ڕۆڵێکی مەزنیان هەبووە لە گواستنەوەی زانستی تەجوید و قیرائەتەکانی قورئاندا, بۆ نەوەکانی دوای خۆیان.

هەڵبەت پەرتووك بە بەردەوامی لەسەر زانستی تەجوید دەنووسرێن, لە کۆندا بەو زانستە دەوترا (حسن الأداء),(فن الترتيل) و(حقّ التلاوة), بەڵام ئێستا بە(علم التجويد) ناسراوە.

---

( تر) (ير) غاية المريد في علم التجويد:(صيريرسمير)

## تێڕوانینی زانایانی شەرع بۆ زانستی تەجوید

تەجوید دوو لا بەخۆیەوە دەگرێت

تەجویدی زانستی (التَّجويد العلمي) | تەجویدی کردەیی (التَّجويد العملي)

أ- تەجویدی زانستی(العلمي): بریتییە لە بەدەستهێنانی زانیاریی لەسەر یاساکانی تەجوید بە شێوەیەکی زانستی، ئەم زانستە بەم جۆرە (فرض الكفاية)ە, لەسەر گشت موسڵمانان. واتە ئەگەر هەندێکیان خۆیان فێری ئەم زانستە کرد, گوناهەکە لەسەر موسڵمانانی ناوچەکە لادەچێت و نامێنێت.

ب- تەجویدی کردەیی(العملي): بریتییە لە جێبەجێکردنی گشت یاساکانی تەجوید, تاکوو لەکاتی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز, بە هەڵە نەخوێندرێتەوە(1) بەتایبەتی ئەو یاسایانەی کە کاریگەرییان لەسەر واتایەکەی هەیە, لەم ڕویەوە دەبێتە (فرض العين), بەڵام نەك لەسەر هەموو قورئانخوینێك.

ئیمامی جەزەری, قورئانخوێنانی, بەسەر سێ جۆردا دابەش کردووە:

أ- المحسن المأجور: ئەو قورئانخوێنەیە, کە شارەزایە لە تەجوید و لەگەڵ قورئان دەخوێنێتەوە (ئەم جۆرە کەسە پاداشتی هەیە).

ب- المسيء المعذور: ئەو قورئانخوێنەیە, کە تەجوید نازانێت, یان کەسێك شك نابات تا فێری بکات, یان لە کاتی فێربوون, زمانی تەتەڵە دەکات(دەگیرێت),ئەم جۆرە کەسە گوناهبارنییە.

ج- المسيء الآثم: ئەو قورئانخوێنەیە, کە کار بە تەجوید ناکات و تەنیا بە بۆچوونی خۆی دەکات و بەڕاست و دروستی ناخوێنێتەوە (ئەم جۆرە کەسە گوناهبارە).

ئیمامی جەزەری دەڵێت:

والأَخْذُ بالتَّجويدِ حَتْمٌ لازِمُ    مَنْ لَمْ يُصَحِحِ القُرآنَ ءاثِمُ (2)

---

(١) أحكام قراءة القرآن: (صـ٢٢-٢٣)    (٢) المقدمة الجزرية/ ٢٧

×× ئیمام أحمدی کوڕی ئیمام محمد بن یوسف الجزری دەڵێت: خوێندنەوەی قورئان بە تەجوید لە پێویستییەکانە (واجبة).

×× ملا علي القارئ (نور الدين أبو الحسن الهَروي) دەڵێ: قورئان بەتەجوید دەخوێندرێتەوە, بۆیە دەبێ وشەکانی نەشێوێن و واتاکەیشی نەگۆڕێت, کە خوێنەر هەڵەیەکیش دەکات, ئەگەر واتای ئایەتەکە نەگۆڕێ ئەوا پێی گوناهبار نابێ.

## پوختەیەك لە ژیانی (ئیمام عاصم) و (ئیمام حفص)

سەرەتا پێویستە ئەم دوو پێشەوایە بناسین، چونكە هەر زانستێكی پەیوەست بە خوێندنەوەی قورئان, كە بەم شێوەیە دەخوێنینەوە, لە ڕێگەی ئەم دوو زانایەوە بە ئێمە گەیشتووە, ئەوانیش (عاصم و حفص)ن, (خوا ڕەحمیان پێ بكات).

**ت- ئیمام عاصم:** ناوی (عاصم ابن أبي النُّجود)ە, پێی دەڵێن (عاصم بن بهدلة الأسدي الكوفي), لە تابعییەكانە, شارەزا بووە لە خوێندنەوەی تەجویددا و پێنجەمین قارئە لە حەوت قارئە ناودارەكان, یاساكانیشی, هەمان ئەو یاسایانە بوون كە لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێی گەیشتبوون, ناوبراو ئەو یاسایانەی فێری ئەو كەسانەش كردووە, كە لای ئەو خوێندوویانە[1].

ئیمام عاصم, قورئانی پیرۆزی لەلای (أبي عبد الرّحمن بن حبيب السُّلمي) و (زِرُّ بنُ حُبَيش الأسدي) خوێندووە و (أبي عبد الرَّحمن السَّلمي) لای (أُبي بن كعب, علي بن ابي طالب, عثمان بن عفان, زيد بن ثابت و عبد الله بن مسعود) خوێندووە و هەموو ئەوانەش لەلای پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خوێندوویانە، هەروەها (زِرُّ بن حُبَيش) لای(عبد الله بن مسعود، علي بن ابي طالب و عثمان بن عفان)ی خوێندوویەتی.

ئیمام (عاصم), (خوا ڕەحمی پی بكات) لە ساڵی ١٢٧ك كۆچی دوایی كردووە.

**پ- ئیمام حفص:** ناوی(حفص بن سليمان بن المغيرة (أبو عمر بن أبي داوود) الأسدي الكوفي البزاز)ە ، لە ساڵی (٩٠ك) لە دایك بووە و پێی دەڵێن: (ربیب عاصم), واتە ئیمام عاصم بەخێوی كردووە، زڕباوكی بووە, لای عاصم قورئانی پیرۆزی خوێندووە و ئەزبەر كردووە، ناوبراو لە خوێندنەوەی پیتەكان و سیفەتەكانیاندا لە هەموو كەسێك زاناتر بووە[2].

زۆر كەس قورئانیان لای (حفص)خوێندووە, لەوانە: (عبيد بن الصّباح ، عمرو بن الصّباح) كە ئەم دوو زانایە ڕیوایەتی(حفص)یان بۆ ئێمە گواستووەتەوە، بەڵام ئەم ڕێگایەی كە ئێمە پێی دەخوێنینەوە, لە ڕێی ئیمام (شاطبي) لە (عبيد بن الصّباح)ەوە بە ئێمە گەیشتووە.

ئیمام حفص لە ساڵی ١٨٠ك كۆچی دوایی كردووە.

**بۆ زانین:** ئەم ڕیوایەتەی كە ئێمە دەخوێنین و لە زۆربەی جیهانی ئیسلامی باوە, پێی دەڵێن:

ڕیوایەتی حفص, لە قیرائەتی (عاصم)ە, لە ڕێی (شاطبي و تیسیر)ەوە[3].

(1) (١٧ك) معرفة القراء الكبار على الطبقات والاعصار: (ص ٧٣- ٧٥) ؛ غاية النهاية: (ج١ /ص٣٤٦-٣٤٩)(ص ٣٥٣- ٣٥٤)

(2) ڕێگای ئیمامی شاطبي(القاسم بن فِيرُّه الشاطبي ٥٣٨- ٥٩٠ هـ), و ڕێگای(التيسير)(ابي عمرو عثمان بن سعيد الدّاني٤٤٤هـ)

## پاداشتی خوێندنەوە و بڵاوکردنەوەی قورئانی پیرۆز

قورئانی پیرۆز پەرتووکی پەروەردگارە, بۆ بەندەکانی ڕەوانە کردووە, تاکوو ببێتە دەستوور و ڕێنیشاندەر لە دنیا, بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی پەروەردگار و ڕێ خۆشکردن بۆ چوونە بەهەشت

بۆ بەدەستهێنانی ئەو خێر و بەرەکەتەی کە لە قورئاندا هاتووە, خوا و پێغەمبەرەکەی (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ), لە چەندین ئایەت و فەرموودەدا، ئێمەیان بۆ خوێندنەوەی قورئان و پەیڕەوکردنی ئاراستە کردووە, بەڵام خوێندنێکی ڕاست و دروست, کە ڕەزامەندی خودای لەسەر بێت, هەروەك دەفەرموێت: ﴿ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ﴾(1)

واتە: قورئان بخوێننەوە, بەڵام خوێندنەوەیەکی ڕاست و دروست.

پێغەمبەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە چەندین فەرموودەدا بەرەو خوێندنەوە و بڵاوکردنەوەی قورئان ئاراستەمان دەکات و ڕێز و پلە و پایەی ئەو کەسەشی بۆ ئێمە دیاری کردووە, کە بەم کارە هەڵدەستێت، هەروەك لەم فەرموودە پیرۆزەدا دەفەرموێت:

« خيركم من تعلم القرآن وعلمه»(2) واتە: باشترینتان ئەوەیە کە خۆی فێری قورئان دەکات و خەڵکیش فێر دەکات.

هەروەها پێویستە بزانین کە پاداشتی خوێندنەوەی قورئان لە دنیا و قیامەت دەگاتە قورئانخوێنەکە, پێغەمبەر لە چەندین فەرموودەدا ئاماژەی بەمە داوە, هەروەك دەفەرموێت: «إنّ الله يرفع بهذا القرآن اقوامًا ويضع به اخرين»(3)

واتە: خوا, بەم قورئانە هەندێکیان بەرز دەکاتەوە, لە دنیا پێش هاتنی قیامەت, هەندێکیشیان نزم دەکاتەوە و کەمنرخ و بەها دەکات.

هەروەها پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت «يَقُولُ الرَّب عَزَّ وَجَلَّ: مَنْ شَغَلَهُ الْقُرْآنُ عن ذِكْرِي و مَسْأَلَتِي أَعْطَيْتُهُ أَفْضَلَ مَا أُعْطِي السَّائِلِينَ وَفَضْلُ كُلَامِ اللهِ عَلَى سَائِرِ الْكَلَامِ كَفَضْلِ اللهِ عَلَى خَلْقِهِ»(4)

واتە: هەر کەسێك بەهۆی سەرقاڵبونی بە قورئانەوە نەپرژێتە سەر زیکرو داواکردنی ڕزق و ڕۆزی دنیا, ئەوا باشتری پێدەدەم, لەو کەسانەی کە داوام لێ دەکەن. فەزل و چاکەی کەلامی خوا, بەسەر گشت کەلامەکاندا, وەك فەزلی خوایە بەسەر بەندەکانیدا.

---

(١) سورة المزمل: ٤ (٢) رواه البخاري:(ج٦ص١٩٢) (٣) رواه أحمد:(ج١ص٣٥)؛ رواه البخاري:(ج٦ص١٩٢)
(٤) رواه الترمذي: (ج٥/ص١٨٤)

پاداشتی گەورە ئەوەیە, کە خوا لە ڕۆژی دوایی دەداتە قورئانخوێنەکە, پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)لەمبارەیەوە دەفەرموێت: «إقرءوا القرآن فإنه ياتي يوم القيامة شفيعًا لأصحابه»(1)

واتە: قورئان بخوێننەوە، چونکە ڕۆژی قیامەت دەبێتە شەفیع و تکاکار بۆ ڕەفیقەکانی.

هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرموێت: « مَنْ قَرَأَ حَرفًا مِن كِتابِ الله فَلَهُ بِهِ حَسَنَة والحَسَنَةُ بِعَشْرِ أمْثالِها ولا أقولُ (الم) حَرفٌ ولَكِن الف حَرفٌ ولام حَرف وميم حَرف »(2)

واتە: هەر کەسێك پیتێك لە قورئان بخوێنێتەوە, خێرێکی بۆ دەنووسرێت, هەر خێرێکیش بە دەیە، بەڵام من پێتان نالێم (الم) پیتێکە، بەڵکوو ئەلیف پیتێکە و لام پیتێکە و میمیش پیتێکە، واتە خێری ئەم سێ پیتە, بەرامبەر بە سی خێرە.

لە بەرامبەر خوێندنەوە و بڵاوکردنەوەی قورئانی پیرۆزدا, پەروەردگار دلۆڤانی بەم کەسە دەبات و لە ڕۆژی دواییدا پلەکانی بەرز دەکاتەوە,

هەروەك پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)دەفەرموێت: « يُقالُ لِقارِيءِ القُرآنِ إقرأ وَارتَقِ وَرَتِّل كَما كُنتَ تُرَتِّلُ فِي الدُّنيا»(3)

واتە: پەروەردگار بە قورئانخوێنەکە دەفەرموێت: قورئان بخوێنەرەوە, هەروەك لە دنیا دەتخوێندەوە, ئینجا بەرز ببەوە لە بەهەشتدا.

هەروەها (عائشە)ی دایکی موسڵمانان, خوا لێی ڕازی بێت, دەیگوت: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: «الَّذِي يَقْرَأُ القُرْآنَ وَهُو ماهِرٌ بِهِ معَ السَّفَرةِ الكِرَامِ البَرَرَةِ، وَالَّذِي يقرَأُ القُرْآنَ وَهُو عليهِ شَاقٌّ فلَهُ أَجْران »(4)

واتە: ئەوەی بە زمانێکی ڕەوان و پاراو قورئان بخوێنێتەوە, ڕۆژی قیامەت لەگەڵ فریشتەکان دەبێت، بەڵام ئەوەی ماندوودەبێت بە خوێندنەوە و فێربوونی قورئانەوە, ئەوا دووخێری بۆ دەنووسرێت, خێری خوێندنەوە و خێری ماندووبوون بە فێربونی قورئانەوە.

داواکارین لە پەروەردگار, کە لە خێر و بەرەکەتی قورئان بێبەشمان نەکات.

---

(1) رواه مسلم: (ج ٢/ ص٥٥٣) (2) رواه الترمذي: (ج٥/ ص١٧٥) ؛ المعجم الوسيط:(ج٢/ص٢٠٣)
(3) رواه الترمذي:(ج٥/ص١٧٧)؛ رواه أبو داود:(ج٢/ص٧٣) (4) رواه ابو داود:(ج٤/ص٥٥)؛ رواه أحمد:(ج٦/ص٤٨)

## خۆڕەوشت و ئادابەکانی خوێنەری قورئانی پیرۆز

زانایانی کۆن و سەدەم زۆر پەرتووکیان لەبارەی ئەو خۆڕەوشت و ئادابانەوە نووسیوە, کە پێویستە قورئانخوێنەکان هەیان بێت, وەك: (أخلاق حملة القرآن) کەهی أبي بكر الأجري (ت بر□سمه)، (التبيان في آداب حملة القرآن)کەهی أبي زكريا يحيى بن شرف النووي (ت □□□ه)، (إحياء علوم القرآن)کەهی أبو حامد الغزالي (ت ترترترتره), ئەمانەش بەشێکن لەو خۆڕەوشت و ئادابانە:

١- پێویستە خوێنەری قورئان بە نیازێکی دروست و بۆ خوا بخوێنێتەوە.

یر- دەستنوێژ هەلگرێت.

سم- بەکارهێنانی سیواك, ئەگەر بەردەست بێت.

شم- پێویستە قورئانخوێن, خۆی پاك بکاتەوە و لە شوێنێکی پاك دابنیشێت.

لە- پێویستە قورئان بە دڵێکی بێدار و شکاو بەرامبەر بە خوای گەورە بخوێندرێتەوە.

□- بە پەنا گرتن بەخوا دەســـــت پێبکات (التَّعَوُذ), هەروەك پەروەردگار فەرمانی داوە و دەفەرمویت: ﴿فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ (سورة النحل: تيني)

□- خوێندنی ﴿بِسۡـمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ لە سەرەتای هـەر سورەتێك, جگە لە سورەتی (التوبة)، چونکە بەبێ (بِسۡـمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) دەخوێندرێتەوە.

تی- پێویستە قورئانخوێن دەنگی خۆی خۆش بکات و بە دەنگەکێ بەرز بخوێنێتەوە، بەلام نابێت زیان بە دەوروبەرەکەی بگەیەنێت.

ئی- پێویستە قورئانخوێن لەسەر ئایەتەکانی کڕنۆش (سـەجدە), بـبات چ لە ناو نوێژدا بێت, یان لە ناو نوێژدا نەبێت, کە پێی دەڵێن: (سجدة التلاوة).

برتر- کاتێك قورئانخوێن, قورئان خەتم دەکات, باشتر وایە زۆر نزا و دوعا بکات, کە پێی دەڵێن دوعای خەتمی قورئان, چونکە دوعایەکانی دوای خەتمی قورئان قبووڵن.

## هەڵە (اللَّحن)

هەڵە( اللَّحن ) [1] لەڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە هەڵە لە خوێندنەوەدا.

لەڕووی زاراوە(إصطلاحا)وە: بریتییە لە خوێندنەوەیەکی نادروست بۆ قورئانی پیرۆز (نەك بەو شێوەیەی کە خوا دایبەزاندووە), جا چ لە یاسایەکی تەجویددا بێت, یاخود لە شیکردنەوە (إعراب)دا بێت, یاخود لە وەستان و دەستپێکردن (الوقف والابتداء)دا بێت.

### دوو جۆرە هەڵە هەن, پێیان دەڵێن:

1- هەڵەی ئاشکرا (اللَّحن الجلي)   ب- هەڵەی شاراوە (اللَّحن الخفي)

أ- هەڵەی ئاشکرا (اللَّحن الجلي): هەڵەیەکە, لە خوێندنەوەی قورئان دەکرێت و دەبێتە هۆی شێواندنی شیکردنەوە (إعراب)ی ئایەتەکە, یاخود واتای ئایەتەکە لەو مانایە دەردەچێت کە پەروەردگار پێی دابەزاندووە, ئەم جۆرە هەڵەیە حەرامە[2] بەتایبەتی, ئەگەر کەسێك بەحەزی خۆی ئەو کارە بکات, دوور نییە لە دین دەربچێت، وەکوو:

أ- گۆڕینی پیتێك بە پیتێکی دیکە، وەکوو:

﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ بە (وَلَا ٱلظَّآلِّينَ) بخوێندرێتەوە، یان کەسێك ﴿عَسَى﴾ بە (عَصَى) بخوێنێتەوە.

ب- گۆڕینی جووڵەیەك (حەرەکەیەك)بە جووڵەیەکی نادروست، وەکوو:

﴿إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْۗ﴾ فاطر:تیبر بە (إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهُ مِنۡ عِبَادِهِ .... ) بخوێندرێتەوە.

ج- گۆڕینی وشەیەك بە وشەیەکی دیکە, وەکوو:

﴿ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ١٣٣ ﴾ (العنکبوت: ...) بە ( وَنَحۡنُ لَهُۥ مُخۡلِصُونَ ١٣٣ ) بخوێندرێتەوە.

د- ئەگەر وەستان و دەستپێکردن نادروست بن، وەکوو:

وەستان لەسەر وشەی (وَٱلۡإِنسَ) لە ئایەتی﴿ وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ﴾الذاريات... (لە)

یان دەستپێکردن لە﴿إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖ ﴾ لە ئایەتی ﴿لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖ﴾ المائدةسمبی)

---

(أ) المعجم الوسيط: (مادة لحن/ جیر/ص...یرتی)

×× اللّحن : لە زۆر بواردا بەکاردەهێندرێت, وەکوو دەڵێن بۆ قسەکردن, یان بۆ ئاوازی گۆرانی, یان بۆ هەڵە، بەڵام لەم بابەتەدا زانایان بۆ مەبەستی هەڵە بەکاریان هێناوە.

(ب) جهد المقل:(صتتت) ؛ المنیر(صیرت)

ب- هەڵەی شاراوە (اللَّحن الخفي): ئەو هەڵەیەیە, کە لە یاسایەکی تەجویدا ئەنجام دەدرێت، بەڵام واتایەکی هەڵە بە وشە نابەخشێت, بۆیە خوێنەر بەم هەڵەیە گوناهبار نابێت, بەڵام دەبێتە هۆی شێواندنی جوان خوێندنەوە, بۆیە زانایان دەڵێن: خوێندنەوە بەم هەموو هەڵەیە, کارێکی مەکروهە, واتە باش نییە، وەکوو:

درێژکردنەوە یان کورتکردنەوەی پیتی (مەددە), وەکوو:
(مد اللازم شەش حەرەکەیە و مد الواجب و مد الجائز (٤ ، ٥)حەرەکەیە و مد البدل دوو حەرەکەیە و.... هتد).
یاخود هەڵە خوێندنەوە لە هەر یاسایەکی دیکەی تەجوید، وەکوو: (هەڵەکردن لە (إدغام)دا, یان لە (إخفاء)دا, یاخود لە مینگە (غنة)ی تەواو و نەتەواو و.... هتد)

زانیاری

أ-(اللَّحن الجلي) بەم ناوە ناونراوە، چونکە هەڵەیەکی ئاشکرایە و هەموو کەسێك دەزانێت کە هەڵەیەك لە خوێندنەوەی قورئاندا کرا.
ب-(اللَّحن الخفي) بەم ناوە ناونراوە، چونکە هەڵەیەکی شاراوەیە و هەموو کەسێك نازانێت, تەنیا ئەو کەسەی لەم زانستەدا شارەزایە بەم هەڵەیە دەزانێت.(1)

زانیاری

زۆرجار سورەتی (الفاتحة) , بە هەڵە دەخوێندرێتەوە, بۆیە هەندێك زانای موسڵمانان, ئێمەیان ئاگادار کردووەتەوە, کە هیچ هەڵەیەك لەم سورەتەدا نەکەین، چونکە کۆڵەگەی نوێژە, بۆیە هەر هەڵەیەك لەم سورەتەدا بکرێت, دوور نییە, نوێژەکەمان قبوولْ نەبێت, بەتایبەتی ئەو هەڵانەی کە دەبنە هۆی گۆڕینی واتاکان (اللَّحن الجلي)، وەکوو:

| | | | |
|---|---|---|---|
| أَنۡعَمۡتَ | کەسێك بە | ( أَنۡعَمۡتُ ) | بخوێنێتەوە |
| غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ | کەسێك بە | (غَيۡرِ ٱلۡمَغۡظُوبِ) | بخوێنێتەوە |
| وَلَا ٱلضَّآلِّينَ | کەسێك بە | (وَلَا ٱلظَّآلِّينَ) | بخوێنێتەوە |

---

(1) جهد المقل:(ص١١٣)

## خێرایەکانی خوێندنەوەی قورئان

ئەگەر بپرسن کام لە خێراییەکان دروستن کە قورئانی پێ بخوێندرێتەوە؟
زانایان سێ جۆرە خێراییان بۆ دروست خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز دیاری کردووە:

**ـتر- التَّحقيق:** خوێندنەوەی قورئان بە شێوەیەکی نەرم و لەسەرخۆ, لەگەڵ خوێندنەوەی گشت یاساکانی تەجوید(1) وەکوو (درێژکردنەوەی پیتەکانی مەددە و خوێندنەوەی مینگە (الغنّة) و خوێندنەوەی گشت جووڵە (حركة)کان و خوێندنەوەی تێکهەڵکێشان (إدغام) و شاردنەوە (إخفاء) و... هتد)، بەڵام پێویستە خوێنەر وریا بێت, هەر یاسایەك, لە مافی خۆی زیاتری پێ نەبەخشێت, بەم جۆرە, خوێنەر دەتوانێت لە ماوەی نزیکەی (لهشم) کاتژمێردا قورئان خەتم بکات.

**ـیر- الحدر:** خوێندنەوەی قورئان بەشێوەیەکی خێرا, لەگەڵ خوێندنەوەی گشت یاساکانی تەجوید، بەڵام دەبێت وریابن لەوەی خوێندنەوەی خێرا نەبێتە هۆی ئاوێتەبوونی پیتەکان و ونبوونی هەندێك یاسای تەجوید، بەم جۆرە, خوێنەر دەتوانێت لە ماوەی نزیکەی (لهـتر) کاتژمێردا  قورئان خەتم بکات.

**- التَّدوير:** خوێندنەوەی قورئان بە شێوەیەکی مامناوەند, لە نێوان (تحقيق) و(حدر)دا لەگەڵ خوێندنەوەی گشت یاساکانی تەجوید(2)، بەم جۆرە, خوێنەر دەتوانێت لە ماوەی نزیکەی (ـبرسم) کاتژمێردا  قورئان خەتم بکات.

ئیمامی جەزەری دەڵێت(3):

| | |
|---|---|
| ويُـقرأُ القُـرآنُ بالتَّـحْقيـق مَـعْ | حَدرٍ وتَدْويرٍ وكلٌ متَّبعْ |
| مَعَ حُسْنِ صَوتٍ بلُحونِ العَرَبِ | مُـرَتَّلًا مُجَوَّدًا بالـعَرَبِي |

**تێبینی**

هەندێك زانا, ڕێگایەکی دیکە زیاد دەکەن, پێی دەڵێن: (الترتيل)، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت, خوێندنەوەی قورئان بە (ترتيل) هەرسێ ڕێگاکەی ڕابردوو دەگرێتەوە، چونکی پەروەردگار فەرموویەتی ﴿وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا﴾
واتای تەرتیل: بریتییە لە خوێندنەوەی یاساکانی تەجوید, هەروەها وەستان لەسەر شوێنە ڕاستەکان لەناو ئایەتەکەدا, هەروەك (علي بن أبي طالب) شیکردۆتەوە.

---

(ـتر) (ـیر) التحديد في الاتقان والتجويد: (صـتي- ـبي)
(ـسم) طيبة النشر:(صـتى)

# بەشی دووەم

□- ( الاستعاذة )

ير- ( البسملة )

□- شێوازەکانی دەستپێکردنی خوێندنەوە لەسەرەتای سورەتەوە

شم- شێوازەکانی بەیەکگەیاندنی دوو سورەت

ته جويدى شايان

بوَ فيَربوني قورئان

## الاستعاذة

(الاستعاذة) لەڕووی زمانەوانییەوە: بە واتای داوای پاراستن دێت.[1]

لەڕووی زاراوەوە: پێش خوێندنەوەی قورئان, خوێنەر پەنا بەخوا دەگرێت لە شەیتانی نەفرەتلێکراو.[2]

### جۆرەباوەکانی (إستعاذ)ە

تر- اعوذ بالله من الشيطان الرجيم[3]

یر- أعوذ بالله من الشيطان الرجيم إن الله هو السميع العليم[4]

سم- أعوذ بالله السميع العليم من الشيطان الرجيم مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخِهِ وَنَفْثِهِ[5]

شم- أعوذ بالله السميع العليم من الشيطان الرجيم[6]

ئیمامی (الجزري) هەشت ڕێگای (إستعاذ)ەی لە پەرتووکی (النشر)دا نووسیوە.

### تێڕوانینی زانایان بۆ (إستعاذ)ە

زانایانی موسڵمانان (زانایانی قیرائەتەکان و فەقیهەکان) کۆکن لەسەر ئەوە کە(استعاذ)ە بەشێك نییە لە قورئان، بەڵام چەند بۆچوونێك هەن بۆ خوێندنەوەی (استعاذ)ە لەگەڵ خوێندنەوەی قورئان پیرۆز (چ لە سەرەتای سورەتەوە بێت, یان ناوەڕاستی سورەت)، لەو بووچۆنانە:

تر-مستحبة: لەکاتی خوێندنەوەی قورئان, لای زۆربەی زانایان و(صحابە)و(تابع)یەکان و پێشەوایانەی موسڵمانان, وەکوو: (أبي حنيفة و شافعي وأحمد بن حنبل), (استعاذ)ە, لە داواکراوە جوانەکانە.[7]

یر- واجبة: بەپێی قسەی (عطاء بن رباح, سفيان الثوري, فخر الدين الرازي).[8]

هەموو زانایان پەیڕەوی ئەم ئایەتەیان کردووە: ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾النحل‌تێنی بەڵام وەکۆ یەك لە وشەی(فَٱسْتَعِذْ)تێنەگەیەشتون,ئایا (واجبە)یانیش(مستحبە).

---

(تر) لسان العرب: (مادة عوذسە/تێنێشم) (یر) هدايةالقاري الى تجويد كلام الباري:(جیر/ صبر□لە)

(سم) ئەم جۆرە لەلایەن(نافع، ابن عامر، الكسائی، حمزه، أبی عمرو، ابن سیرین، الاوزاعی و سفيان الثوري)ی خوێندراوەتەوە و لەلایەن زانایانی قیرائەتەکانیشەوە هەڵبژێردراوە, بەپێی ئەم ئایەتە: ﴿فَإِذَاقَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾

(شم) ئیمامی ڕازی لە تەفسیرەکەیدا لە ئیمام ئەحمەدەوە گواستووەتەوە, بەپێی فەرموودەی خوا ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾سورة فصلت هەروەها ئەمە لەلایەن ئیمام نافع و ابوعامر و کسائی هەڵبژێردراوە.

(لە) رواه أحمد:(جمە/صبر لەسم)؛ السنن الكبير للبيهقي:(جمە/صنیتیسم)

(□) هەندێك لە زانایان ئەم جۆرە بە ڕاست دەزانن، چونکە لە جۆری پێش ئەمە کورتکراوەتەوە.

(□)(تی) النشرفي القراءات العشر:(تر/صتی لەیر)؛ هداية القاري: (جیر/صنی لەلە)؛ أحكام قراءة القرآن الكريم:(صیرسمسە)

## ئەو شوێنانەی(أستعاذة)ی تێدا دەخوێندرێتەوە (مواطن الاستعاذة)

أ- بە دەنگێکی کپ ونزم (سرًا)[1]:

١-لە سەرەتای گشت سورەتەکان، بەڵام لەوکاتەی کە قورئان بە دەنگێکی نزم دەخوێندرێتەوە.

٢- کاتێك کە لەگەڵ کۆمەڵێك خوێنەر دەخوێنینەوە، بەڵام بەو مەرجەی مرۆڤ یەکەم خوێنەر نەبێت دەست پێبکات.

٣- لە نوێژدا, لە سەرەتای (سورة الفاتحة) چ نوێژە بەدەنگەکان, یان بێدەنگەکان بن.

٤- کاتێك هەست بە وەسوەسەی ئەهریمەن(شیطان)دەکەین, هەروەك پەروەردگار دەفەرموێت:﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٞ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾(سورة فصلت-٣٦)

ب- بە دەنگێکی بەرز (جهرًا)[2]:

١- کاتێك خوێنەر بۆ هەندێك کەس بە دەنگێکی بەرز(جەهری) دەخوێنێتەوە.

٢- کاتێك مرۆڤ لەگەڵ هەندێك خوێنەری دیکە دەخوێنێتەوە, بەڵام بەمەرجێك, مرۆڤ یەکەم کەس بێت دەست پێبکات.

٣- ئەگەر مەبەست لە خوێندنەوەی, فێرکردن بێت.

**تێبینی**

١- بەپێی بووچوونی پێشەوایانی قیرائەتەکان, پێویستە خوێنەر (تەعوید) بخوێنێتەوە, جا چ ل دەستپێکی سورەتەکە, یاخود لە ناوەراستی سورەتەکە بێت، چونکە فەرمانی پەروەردگارە, هەروەك دەفەرموێت: ﴿ فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ (سورة النحل-٩٨)

٢- لەکاتی پشمین یان کۆکە, یاخود سەجدەی خوێندنەوە, یان هەر قسەیەك کە پەیوەست بێت بە خوێندنەوەوە, ئەوا (ئیستیعاذە و بسم الله) دووبارە ناکرێنەوە.

٣- کاتێك کە قسەیەکی دوور لە خوێندنەوە دەکرێت, یاخود وەڵامی سڵاو دەدرێتەوە, پێویستە (ئیستیعاذە و بسم الله) دووبارە بکرێنەوە, یاخود (ئیستیعاذە) بەتەنیا بخوێندرێتەوە.

---

(١) (٢) النشر في القراءات العشر: (ج١/ ص٢٥٢-٢٥٤)

## بسم الله (البسملة)

(البسملة) واتە: ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾.
پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەر(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کردووە, کە (بسم الله) بۆ بەرەکەت لە دەستپێکی هەموو کارێك بخوێنێتەوە, بۆ گشت موسڵمانانیش کردووە بە سوننەت، بەڵام لەگەڵ قورئانی پیرۆز, زانا موسڵمانەکان کۆکن کە (بسم الله) لە دەستپێکی هەموو سورەتێك دابەزیوە, جگە لە (سورة التوبة), هەروەها پارچەیەکە لەم ئایەتەش:
﴿ إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣٠﴾ (النمل-٣٠)
بەڵام زانایان کۆك نین لەسەر ئەوە کە ئاخۆ ئایەتێکە لە(سورة الفاتحة), یاخود ئایەتێك نییە لێی، خوێنەرە مەککییەکان و کوفییەکان بە ئایەتێك لە (سورة الفاتحة) هەژماری دەکەن، بەڵام خوێنەرەکانی مەدینە و بەصرە و شام بە ئایەتێك لە (سوره الفاتحه)هەژماری ناکەن، واتە لای ئەم زانایانە, ئایەتی کۆتایی دەبێتە دوو ئایەت، بەم جۆرە:
﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ ٦ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ٧﴾

## ئەو جێگایانەی (بسم الله) تێدا دەخوێندرێتەوە:

ئ- دەستپێکی سورەتەکان: گشت زانایانی قیرائەتەکان کۆکن لەسەر ئەوە کە پێویستە (بسم الله) لە دەستپێکی گشت سورەتەکان بخوێندرێتەوە, لە سەرەتای دەستپێکردنییەوە, جگە لە (سورة التوبة)، چونکە بەبێ (بسم الله) دابەزیوە.
ب-ناوەڕاستی سورەتەکان: زانایانی قیرەئەتەکان دەڵێن: (دروستە (بسم الله) لە ناوەڕاستی سورەتەکە بخوێندرێتەوە یان نەخوێندرێتەوە)، بەڵام لەسەر خوێندنەوەی (بسم الله) لە ناوەڕاستی (سورة التوبة) کۆك و یەکدەنگ نین.
**کاتێك(بسم الله)لە ناوەڕاستی سورەتەکان دەخوێنینەوە, پێویستە ئەم سێ خاڵە ڕەچاو بکەین:**

أ-هەر ئایەتێك کە دەخوێندرێتەوە ئەگەر بە(ناوێك, سیفەتێك و ئامرازێك)دەستپێبکرێت, کە بۆ پەروەردگار بگەڕێتەوە, ئەوە دەبێ (بسم الله) بخوێندرێتەوە, وەکوو:
﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ هُوَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ﴾(غافر-تی□)
ب- ئەو ئایەتەی کە دەخوێندرێتەوە, ئەگەر بە ئامرازێك یان سیفەتێکی شەیتان دەستپێکردبێت, ئا لەوکاتەدا پێویستە(تعویذ) لەجیاتی (بسم الله) بخوێندرێتەوە, وەکوو:
﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ﴾ (الاعراف-□یر)

ج- ئەو ئایەتەی کە دەخوێندرێتەوە, ئەگەر هەڵوێستێك بێت یان یاسایەكی شەرعی بێت یان هەر ئایەتێکی دیکە بێت, جگە لەو دوو خاڵەی ڕابردوو, دروستە خوێنەر(بسم الله)یەکە بخوێنێتەوە یان نەخوێنێتەوە, بەڵام خوێندنەوەکەی باشترە, هەروەك ئیمام (ابن بري)(خوا لێی ڕازی بێت)دەڵێت: (1)

واختارها بعض أولي الأداء ..... لفضلها في أول الأجزاء

وەکوو: ﴿ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴾ (الانعامسمنى)

﴿وَلَا تَسۡتَوِي ٱلۡحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُۚ﴾ (فصلت شمسه)

سم- لە نێوان دوو سورەتدا(کاتی بەیەکگەیاندنیان) :

أ- (قالون و الكسائي و عاصم و ابن كثير وأبو جعفر) بەیەکگەیاندن لەگەڵ (بسم الله).
ب- (حمزة و خلف العاشر) بەیەکگەیاندن بەبێ (بسم الله).
ج- (ورش و أبو عمرو و ابن عامر ويعقوب)دەڵێن: بە سێ شێواز دەخوێندرێتەوە:

تر- بەیەکگەیاندن لەگەڵ (بسم الله).
یر- بەیەکگەیاندن بە سەکتە و بەبێ (بسم الله).
یر- بەیەکگەیاندن بەبێ (بسم الله).

بۆ زانین: لەکاتی بەیەکگەیاندنی (سورة الناس) و (سورة الفاتحة), یان کۆتایی سورەتێك لەگەڵ سورەتێکی پێش خۆی, یاخود کۆتایی سورەتێك لەگەڵ دەستپێکی هەمان سورەت, پێویستە گشت خوێنەران (بسم الله) یەکە بخوێننەوە.

**تێبینی**

هەر پێشنوێژ(امام)ێك بەقیرائەتی عاصم بخوێنێتەوە, پێویستە (بسم الله) یەکەش بەهەمان شێوەی ئایەتەکانی دواتر بخوێنێتەوە، واتە لە نوێژە جەهرییەکاندا, بەدەنگێکی بەرز بخوێنێتەوە و لە نوێژە بێدەنگەکانیشدا, بە دەنگەکی نزم بخوێنێتەوە, چونکە بەپێی قیرائەتی عاصم (بسم الله) ئایەتی یەکەمە لە (سورة الفاتحة)ە.

---

( تر) هداية القاري:(صير لە)؛ الدرر اللوامع بشرح العلامة المارغيني:(صيرسم)

## شێوازەکانی دەستپێکردنی سورەت بە ئیستیعاذە و بسم الله

١- پچراندنی هەمویان: خوێندنەوەی هەریەك لە (ئیستیعاذە) و (بسم الله) لە دەستپێکی سورەتەکە, بەشێوەی جیاجیا, پاشان سورەت، وەکوو:

﴿ أعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ ﴾ وەستان ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ وەستان
﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾

٢- خوێندنەوەی (ئیستیعاذە) بەتەنیا, ئینجا بەیەکگەیاندنی (بسم الله) لەگەڵ سەرەتای سورەتەکە، وەکوو:

﴿ أعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ ﴾ وەستان ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ بەیەکگەیاندن قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾

٣- خوێندنەوەی هەریەك لە(ئیستیعاذە) و (بسم الله) پێکەوە, ئینجا خوێندنەوەی دەستپێکی سورەتێکی جودا، وەکوو:

﴿ أعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ بەیەکگەیاندن بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ وەستان ﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾

٤- بەیەکگەیاندنی هەمویان: خوێندنەوەی (ئیستیعاذە) و (بسم الله) و دەستپێکی سورەتەکە پێکەوە، وەکوو:

﴿ أعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ بەیەکگەیاندن بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ بەیەکگەیاندن قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾

دەستپێکردنی خوێندنەوە لە سەرەتای(سورة التوبة), بە دوو ڕێگا دەخوێندرێتەوە:

أ- لێکجیاکردنەوەی(ئیستیعاذە) و دەستپێکی سورەتەکە, وەکوو:

﴿ أعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ ﴾ وەستان ﴿ بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ﴾

ب- بەیەکگەیاندنی (ئیستیعاذە) لەگەڵ سەرەتای سورەتەکە: وەکوو:

﴿ أعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ بەیەکگەیاندن بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ﴾

## شێوازەکانی بەیەکگەیاندنی دوو سورەت

**تر**
(پچراندنی هەمویان):
کۆتایی سورەتەکە و(بسم الله) و دەستپێکی ئەو سورەتەی کە بە دوایدا دێت،
وەکوو: ﴿وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴾ وەستان ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ وەستان ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾

**یر**
وەستان لە کۆتایی سورەتەکە, ئینجا بەیەکگەیاندنی بسم الله لەگەڵ دەستپێکی ئەو سورەتەی کە بە دوایدا دێت،
وەکوو:
﴿وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ﴾ وەستان ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾

**سم**
(گەیاندنی هەمویان):
بەیەکگەیاندنی کۆتایی سورەتەکە لەگەڵ(بسم الله) لەگەڵ دەستپێکی ئەو سورەتەی کە بە دوایدا دێت، وەکوو:
﴿وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾

**شم**- بەیەکگەیاندنی کۆتایی سورەتەکە لەگەڵ بسم الله, ئینجا وەستان, پاشان دەستپێکردن بەو سورەتەی, کە بە دوایدا دێت، وەکوو:
﴿ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ وەستان ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾

بۆ زانین: ئەم جۆرەی چوارەم نادروستە لە خوێندنەوەدا، چونکە ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ لە دەستپێکی سورەتەکان دابەزیوە, نەك لە کۆتایی سورەتەکان.

شێوازی بەیەکگەیاندنی(سورة الانفال) لەگەڵ(سورة التوبة)بەبێ(بسم الله)بە سێ ڕێگا دەبێت[1]:

تر- وەستان لە نێوان هەردوو سورەتەکەدا:
﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ٧٥ ﴾ وەستان ﴿بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ﴾

یر- بەیەکگەیاندنی کۆتایی (سورة الانفال) لەگەڵ دەستپێکی (سورة التوبة)، بە سەکتە:
﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ وەستانی بێ هەناسە (سكت) بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ﴾

سم- بەیەکگەیاندنی کۆتایی (سورة الانفال) لەگەڵ دەستپێکی (سورة التوبة):
﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ﴾

---

(تر) النشر (جتر/ص ني یر) ؛ البدور الزاهرة:(صشمتر)

# بەشی سێیەم

- پیتەکانی زمانی عەرەبی ( الحروف العربية )
یر- دەرچەی پیتەکان( مخارج الحروف )
- پیتە لاوەکییەکان ( الحروف الفرعية )
شه- پیتە بچووکەکان ( الحروف الصّغيرة )
- جیاوازیی نێوان پیتی ( ض ) و پیتی ( ظ )
- سەر و ژێر ( الحركات )
-نازناوی پیتەکان ( القاب الحروف )
تی- سیفەتەکانی پیتەکان ( صفات الحروف )
- سیفەتە پێویستەکان و هاودژەکانیان ( صفات لازمة لها ضد )
بر- ماوەی پیتەکان ( أزمنة الحروف )
- سیفەتە پێویستەکان و ناهاودژەکانیان ( صفات لازمة ليس لهاضد )
یر- سیفەتە کاتییەکان ( الصفات العارضة )

تە جویدی شایان
بۆ فێربونی قورئان

## پیتەکانی زمانی عەرەبی

أ- پیتە سەرەکییەکان (الحروف الاصلية)

ب- پیتە لاوەکییەکان (الحروف الفرعية)

ﭢ- پیتە ئەبجەدییەکان (الحروف الأبجدية)

ﭪ- پیتە هیجائییەکان (الحروف الهجائية)

**ﭢ- پیتە ئەبجەدییەکان**[1]**:** ژمارایان ( ﭣ ) پیتە, ئەم پیتانە لەلایەن ڕۆژهەڵاتییەکانەوە بەدوای یەکتریدا دەنووسرێن, بەم شێوەیە:

﴿ أَبْجَدْ ، هَوَّزْ ، حُطِّي ، كَلَمُنْ ، سَعْفَصْ ، قَرَشَتْ ، ثَخَذٌ ، ضَظَغٌ ﴾

لای ڕۆژئاوایەکانیش بەم شێوەیە نووسراون:

﴿ أَبْجَدْ ، هَوَّزْ ، حُطِّي ، كَلَمُنْ ، صَعْفَضْ ، قَرَسَتْ ، ثَخَذٌ ، ظَغَشٌ ﴾

**ﭪ- پیتە هیجائییەکان:** ژمارایان (ﭫ) پیتە[2] , هەروەك ئیمامی (أحمد الطيبي) دەڵێت:

وعِدَّةُ الحُروفِ لِلهِجَاءِ    تِسعٌ وَعِشرُون بِلا امتِراءِ[3]

ئەم پیتانە لەلایەن هەردوو زانا (النصر بن عاصم الليثى، يحيى بن يعمر), بەپێی نزیکبوونەوەی وێنەکانیان, نووسراونەتەوە و لێکجیا کراونەتەوە, لە ڕێگەی دانانی خاڵ بۆ سەرەوەو و ژێرەوەی هەندێك لەپیتەکان.

---

(١)(ﭪ) جیاوازیی نێوان ژمارەی پیتە هیجائییەکان, کە (ﭫ) پیتن, لەگەڵ پیتە ئەبجەدییەکان, کە (ﭣ) پیتن, بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، چونکە پیتی هەمزە دەخوێندرایەوە و هیچ وێنەیەکیشی نەبوو، بەڵام زانای ناودار(الخليل بن احمدالفراهيدي) سەری پیتی(ع )ی بڕی و پیتی هەمزە (ء)ی لێ دروستکرد, بەهۆی لێکنزیکبوونەوەی دەرچەی هەردوو پیتەکە(ء)و (ع).

() منظومة المفيد في التجويد/ ني

## پیتە هیجائییەکان (الحروف الهجائية) و ناوەکانیان [2]

دروستە (هەمزە) بەناوی(ألف)[1] بخوێندرێتەوە

(ألف)[١]: دەنگەکە دەخوێندرێتەوە ودەنووسرێتەوە(لا)

| أ | ب | ت | ث | ج | ح | خ | د | ذ | ر |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هەمزە | باء | تاء | ثاء | جيم | حا | خاء | دال | ذال | را |
| ز | س | ش | ص | ض | ط | ظ | ع | غ | ف |
| زاي | سين | شين | صاد | ضاد | طا | ظاء | عين | غين | فاء |
| ق | ك | ل | م | ن | هـ | و | ا | ي | |
| قاف | كاف | لام | ميم | نون | ها | واو | لا | يا | |

ب- پیتە لاوەکییەکان (الحروف الفرعية): بریتین لە ژمارەیەك پیت, زاناکان لەسەر ژمارەکانیان کۆك و یەکدەنگ نین، هەندێك دەڵێن هەشتن, هەندێك دەڵێن شەشن, هەندێکیش دەڵێن پێنجن.

لە لاپەڕە (سەرلە)دا, تیشك دەخەینە سەر ئەم پیتانە و بە باشی بە ئێوەی دەناسێنین.

---

(١) هەندێك لەزاناکان پیتی هەمزە لەسەرەتای وشە, بەناوی (ئەلیف) ناودەنێن, وەکوو(المبرد, السّيوطي و ابن هشام ....), چونکە وەکوو ئەلیف دەنوسرێت, ئەم زانایانە دەڵێن ئەلیفی وشك, بۆ ئەوەی لەئەلیفی مەددی نەرم جیا بکرێت.

(٢) هەندێك پیت لەگەڵ قورئان بە دوو پیت دەخوێندرێنەوە, وەکوو: (طا ، ها ، یا ....), هەندێك پیتیش بە سێ پیت دەخوێندرێنەوە, وەکوو: (میم ، لام ، عین ....)، بەڵام ئەگەر لەگەڵ خوێندنەوەی قورئان نەبێت, ئەوا دروستە پیتە بێ هەمزەکان بەهەمزەکان بخوێندرێنەوە و بنووسرێنەوە, وەکوو: (طاء ، هاء ، یاء ..), هەروەها دروستە پیتی (ز) بە (زاي ، زا ، زيٌّ ، زاء) بخوێنینەوە، بەڵام خوێندنەوەی (زێن) دروست نییە، لە هەمووشیان باوتر و دروستتر (زاي)یە، هەروەك ئیمام(أحمد الطيبي) لە (منظومة المفيد)دا دەڵێت:

وَالْمَدُّ وَالْقَصْرُ جَمِيعاً رُوِيَا ....... فِي: بَا وَتَا وَثَا وَحَا وَخَا وَيَا
وَرَا وَطَا وَظَا وَفَا وَهَا ، فَـزِدْ ....... هَمْزَةً إِنْ شِئْتَ، وَدَعْ إِنْ لَمْ تُرِدْ
ولُغة القصر بها الذِكرُ وَرَد ....... ومن يَعُدَّ الزايَ منها لم يُرَد
ولكن الزايُ بِـيـاءٍ أشـهـر ....... وجاء زِيٌّ دون زَينٍ فانظروا

## دەرچەی پیتەکان (مخارج الحروف)

لە گەرووی هەر کەسێکدا دوو پەردەی دەنگی هەن, پێیان دەڵێن: دەنگەژێیەکان (الأوتار الصوتية), کە بەریەك دەکەون, دەنگی لێوە دێت، بەڵام لەو شوێنەی ڕێ لە دەنگەکەی دەگیرێت, یاخود بەرتەسك دەکرێتەوە, دەبێتە دەرچەی پیتەکە.

**دەرچەی پیتەکان لەڕووی بەرتەسکی و فراوانییەوە دەبن بە دوو جۆر:**

1- دەرچە دەستنیشانکراوەکان ( مخارج محققة): ( 1- گەروو ، 2- زمان ،3- لێو)

2- دەرچە دەستنیشاننەکراوەکان (مخارج مقدرة): 1- بوشایی(دەم, گەروو) 2- بۆشایی لووت (1)

دەرچەی پیتەکان بەشێوەیەکی گشتی, دوو جۆرن

دەرچە سەرەکییەکان (المخارج الرئيسه)

دەرچە لاوەکیییەکان (المخارج الفرعيه)

1- **دەرچە سەرەکییەکان:** هەندێك زانا دەڵێن ژمارەیان پێنجە, هەندێکیش دەڵێن ژمارەیان چوارە، بەڵام لەهەر دەرچەیەکی سەرەکی, دەرچەیەکی لاوەکی, یان زیاتر لە دەرچەیەك دروست دەبێت.

2- **دەرچە لاوەکییەکان:** هەندێك زانا, چواردە دەرچەیان بۆ داناوە, هەندێکیان کردوویانە بە شانزدە, هەندێکیشیان کردوویانە بە حەڤدە(2), بەڵام زۆربەی زانایان لەگەڵ ژمارە حەڤدەن, هەر دەرچەیەکیش شوێنی پیتێك یان دوو پیت یان سێ پیتە.

---

(1) جهد المقلّ:(ص [illegible])

(2) (سيبويه و شاطبي و ابن البري) دەڵێن شانزدەن, چونکە بۆشایی(گەروو و دەم) لای ئەم زانایان دەرچە نییە.

(الفراء و الجرمي وقطرب وابن كيسان)دەڵێن چواردەن, چونکە پیتەکانی(ل, ر, ن)لە یەك دەرچەن, بۆشاییش دەرچە نییە.

(الامام الجزري و الفراهيدي) دەڵێن حەڤدەن, چونکە بۆشایی(گەروو و دەم), دەرچەی تایبەتە بۆ پیتە مەددییەکان.

## دەرچە سەرەکییەکانی پیتەکان (المخارج الرئيسة للحروف)

دەرچە سەرەکییەکانی پیتەکان پێنجن, بەڵام حەقدە دەرچەی لاوەکی لەم دەرچانە دروست بوون, بەم شێوەیەی خوارەوە:

**دەرچە سەرەکییەکانی پیتەکان (المخارج الرئيسة للحروف)**[1]

- بۆشایی (الجوف)
- گەروو (الحلق)
- زمان (اللسان): بەهاوکاری (ددان و مەلاشوو)
- لێو (الشفتان)
- بۆشایی لووت (الخيشوم)




بۆ زانین: ئەو زانایانەی دەرچە سەرەکییەکان دەکەن بە چوار, بەم جۆرە جیایانکردۆنەتەوە: ( تر- بۆشایی دەم و گەروو، یر- گەروو، سم- دەم (زمان، لێو، مەلاشوو، ددان) شم- بۆشایی لووت)[2]

---

×× وێنەی دەرچە و سیفەتی پیتەکان لە پەرتووکی (التجويد المصور) وەرگیراون, دوای ئەوەی کە مۆڵەتمان لە نووسەرەکەی, بەرێز(دکتور أيمن رشدى سويد) وەرگرت.

(تر) هداية القاري:(صشم□)؛ التجويد المصور:(سمني)  (ير) التجويد المصور:(صبربي)

| دەرچە سەرەکییەکان | ژمارەی دەرچەی لاوەکییەکان | پیتەکانی دەرچەکان |
|---|---|---|
| بۆشایی دەم و گەروو(الجوف) | یەك دەرچە | ا ، و ، ي |
| گەروو (الحلق) | سێ دەرچە | ء ، ه ، ع ، ح ، غ ، خ |
| زمان (اللِّسان) | دە دەرچە | ق ، ک ، ج ، ش، ي ، ض، ط ، د، ت، ظ ، ث ، ذ ، س، ص، ز ، ل ، ر ، ن |
| لێو (الشَّفتان) | دوو دەرچە | ف ، و ، م ، ب |
| بۆشایی لووت (الخیشوم) | یەك دەرچە | م ، ن |

## بەشەکانی مەلاشوو






- دوانە(الثنايا): (شم) ددان
- چوارینە( الرَّباعيات): (شم) ددان
- کەڵبە (الانياب): (شم) ددان
- زەردە و بزەکان(الضواحك): (شم) ددان
- هارەڕەکان (الطَّواحن): (یرتر) ددان
- خرێنەکان(کاکیلە)(النَّواجذ): (شم) ددان

## بەشەکانی زمان




## بەشەکانی گەروو






## دەرچەی پیتەکان (مخارج الحروف)

بۆ زانینی دەرچەی هەر پیتێك, پێویستە سکون یان شەددە لەسەر پیتەکە دابنێین و هەمزەیەکیش بە فەتحە لە پێش پیتەکە بخوێنینەوە, وەکوو: (أَءْ ، أَمْ، أَبْ، أَفْ، أَسْ، أَظْ ).

بۆ زانینی دەرچەی پیتە مەددەییەکان, بۆ هەر پیتێك حەرەکەیەك لە ڕەگەزی خۆی لەسەر یان لەژێر هەمزەکە دادەنێین, پێش پیتی مەددەکە، وەکوو: ( أَا ، أُو ، إِي ).

### دەرچەی پیتەکانی( ء ، هـ )

دەرچەی خوێندنەوەی پیتەکانی (ء، هـ ) لە کۆتایی گەروو دەردچن (دوورترین شوێن لە گەروو بۆ پێش دەم) لای پەردەکانی دەنگ.

يَأْتِي
مُؤْمِنٌ
أَءِذَا
أَهْلَهُ
يَهْدِي
هَٰذِهِ






پیتی هاء

هەمزەی بەسەر و ژێر(متحرك)

هەمزەی ساکن

### دەرچەی پیتەکانی (ع،ح)

نَعْبُدُ
بَعْضُ
مَنَعَ
يَحْسَبُ
نَّحْنُ
صُحُفِ







دەرچەی خوێندنەوەی هەردوو پیتی (ع ، ح) لە ناوەڕاستی گەروو دەردەچن لەلای زمانەبچکۆڵە (لسان المزمار)

## دەرچەی پیتەکانی(غ ، خ)

پیتەکانی (غ ، خ) لە سەرەتای گەروو دەردەچن (لە کۆتایەکەی زمان)، پیتی (خ) تۆزێك نزیکترە لە پیتی (غ).




يَغْفِرُ
تُغْنِيَ
غَفَرَ
بَلِغُ

يَخْرُجُ
يُخْلِفَ
خُلِقَ
نُفِخَ




## دەرچەی پیتی (ق)

کۆتایی زمانەکە بەرز دەبێتەوە و بە مەڵاشووی دەمەوە دەنووسێت (لای گۆشت لە مەڵاشووی سەرەوە)




أَقْبَلَ
أَقْطَارِ
شَقَقْنَا
قِيلَ

## دەرچەی پیتی (ک)

کۆتایی زمانەکە بەرز دەبێتەوە و بە مەڵاشووی دەمەوە دەنووسێت (لای گۆشت و ئێسك لە مەڵاشووی دەم)




يَكْتُبُ
بُكْرَةً لَكُمْ
بِشِرْكِكُمْ

## دەرچەی پیتەکانی (ج ، ش ، ي)

بۆ خوێندنەوەی پیتی (ج) ناوەڕاستی زمانەکە بەرز دەبێتەوە و بە مەڵاشووی دەمەوە دەلکێت.

يَجْعَلُ
وَجْهَكَ
جُمِعَ
يَلِجَ




بۆ خوێندنەوەی پیتەکانی (ش ، ي نامەددی) ناوەڕاستی زمانەکە بەرز دەبێتەوە بۆ مەڵاشووی دەم، بەڵام بۆشاییەك لە نێوان زمان و مەڵاشووی دەمدا دەمێنێتەوە،

أَشْهَدُ
يَشْكُرُ
وَشَهِدَ
أَشُدَّهُ







إِلَيْكَ
حَيْثُ
يَلِجَ
لِيُضِلَّ

# دەرچەی پیتی (ض)

لایەك یان هەردوولای زمانەكە پێكەوە بە ددانەكانی بەرامبەر خۆیانەوە لە ڕیزی سەرەوە دەلكێنین, سەری زمانیش دەگاتە پشت ددانەكانی پێشەوە لە مەلاشووی دەم, هەروەك لە وێنەكەدا دیارە:







فَضْلُ
بِضْعَ
يَضِلُّ
تَفِيضُ



## دەرچەی پیتی (ل)

نزیکترین شوێن لە لێواری زمان, تا کوتایی سەری زمان لەسەر پوکەکانی ددانەکانی سەرەوە دادەنێین و دەنگی پیتی (ل) لە هەردوو لای زمانەوە دەردەچێت[1],
هەروەك لە وێنەکەدا دیارە:

بۆ خوێندنەوەی لامی (لّ) قەڵەو, کۆتایی زمان بەرز دەبێتەوە و ناوەڕاستی زمانیش قووڵ دەبێتەوە، بەڵام بۆ خوێندنەوەی لامی (ل) سووك, کۆتایی زمان نزم دەبێتەوە.

ٱللَّهُ
هُوَ ٱللَّهُ
نَصۡرُ ٱ
للَّهِ




قُلۡتَ
جَعَلۡنَا
جَعَلَ
مَثَلُهُ



ئەو شوێنەی زمان بە ئەستەم دەیگاتێ لە مەڵاشووی سەرەوە




---

(1) هەندێك زانا دەڵێن: پیتی لام لە لای ڕاستی زمان دەردەکەوێت و دەنگی پیتەکە بۆ لای چەپ لادەدات، هەندێکیش دەڵێن لە هەردوو لای زمان پێکەوە لەگەڵ مەڵاشووی دەم دەردەچێت و دەنگەکەی لادەدات بۆ هەردوولای زمانەکە، ئێمە دەڵێین خویندنەوەی پیتی (لام) بەهەردوو شێوەکە دروستە.

## دەرچەی پیتی (ن)

پیتی نون (ن) دوو دەرچەی هەیە
( ج- دەم ، خ- بۆشایی لووت)
ج- دەم: پێشی زمان لەسەر پووکی ددانەکانی سەرەوە دادەنێین.
خ- بۆشایی لووت: هەندێك لە دەنگی نون لە لووتەوە دەردەچێت, کە پێی دەڵێن مینگە(الغنە).




يَكُنْ
يَنْهَىٰ
وَنُنَزِلُ
سُنَنَ

## دەرچەی پیتی (ر)

پێشی زمان لەسەر پووکی ددانەکانی سەرەوە دادەنێین(کەمێك لە دەرچەی نون دواترە) و بۆشاییەك لە سەری زمان بەجێدێڵین, تاکوو دەنگی (رِاء) لێی دەربچێت و پیتی(راء) زۆرجار دووبارە نەبێتەوە، هەروەك لە وێنەکەدا دیارە:

بۆ خوێندنەوەی ڕائی قەڵەو (ڕ), کۆتایی زمان بەرز دەبێتەوە و ناوەڕاستی زمانیش قووڵی دەبێتەوە، بەڵام بۆ خوێندنەوەی ڕائی سووك (ر), کۆتایی زمان نزم دەبێتەوە.









يَرْجِعَ
فَفَرَرْتُ
شَرِبَ
كَرِيم
سُرُرٍ

## دەرچەی پیتەکانی( ط ، د ، ت )

بۆ خوێندنەوەی پیتەکانی (ط ، د ، ت) پێشی زمان دەگاتە بنی جووت ددانەکەی پێشەوە لە ریزی سەرەوە، هەروەك لە وێنەکەدا دیارە:

يُطْعِمُ
يَطْبَعُ
حَبِطَ
فَقُطِعَ







أَفَلَتْ
تُتْلَىٰ
يُدْخِلُ
مَدَدْا
قَدْ بَدَتِ

## دەرچەی پیتەکانی (ص ، ز ، س)

بۆ خوێندنەوەی پیتەکانی (ص، ز ، س) سەری زمان دەخەینە ژێر ددانەکانی بنەوە و دەنگی پیتەکە لە نێوان ددانەکانی پێشەوەدا دەردەچێت, هەروەك لە وێنەکەدا دیارە:

أَصْبَحَ
مِصْرَ
صَدَقَ
قِصَا
صْ







بِسْمِ
يَسْجُدُ
وَرِزْقُ
فَعَزَزْنَا
يَسْتَهزِئُ

## دەرچەی پیتەکانی(ظ ، ذ ، ث)

بۆ خوێندنەوەی پیتەکانی (ظ ، ذ ، ث) پیشی زمان دەگاتە سەری هەردوو ددانی پێشەوە, لە ریزی سەرەوە, تۆزێکیش لە دەرەوە بەدیاردەکەوێت،

هەروەك لە وێنەکەدا دیارە:

أَظۡفَرَ
يَظۡلِمُ
نَظَرَ
ظُلِمَ







أَخَذۡنَا
أَخَذَ
بِإِذۡنِي
مِثۡلَ
يُغَاثُ

## دەرچەی پیتی (ف)

هەردوو ددانی
پێشەوەی سەرەوە
لەسەر لێوی خوارەوە
دادەنێین (بەشە
تەرەکەی لێو) لە
دیوی ناوەوە.




تَفۡجُرَ
يُخَفِّفۡ
فَفَزِعَ
تَصِفُ

## دەرچەی پیتی (م)

میم دوو دەرچەی هەیە:

( ١- لێو، ٢- بۆشایی لووت)

١- لێو: هەردوو لێوەکە بەنەرمی (لە دیوی دەرەوە) لەسەر یەك دادەنێین.

٢- بۆشایی لووت: هەندێك لە دەنگی میم لە لووت دەردەچێت کە پێی دەڵێن مینگە(الغنە).




بِحَمْدِهِ
مُمْسِكَ
أُمَم
مُمَرَّدٌ

---

## دەرچەی پیتی (ب)

هەردوو لێوەکان لەسەر یەك دادەنێین (لە دیوی ژوورەوە)




تُبْتُ
صِبْغَةَ
بِسَبَبٍ
يَتُوبُ

## دەرچەی پیتی ( و )ی نامەددی [1]

بۆ خوێندنەوەی پیتی (واو)، لێوەکانمان خڕ دەکەین و کۆتایی زمانیش تۆزێك بەرزدەبێتەوە.






يَوْمَ
وَلَوْ
عَصَوْ
كَ
وَوُضِعَ

---

## دەرچەی پیتە مەددییەکان( ا ، و ، ي )[2]

| پیتی ئەلیف ( ا ) (الألف المدّية) زمان لە باری ئاسایێدا دەبێت (لە خوارەوە) | پیتی واو (و) (الواو المدّية) کۆتایی زمان بەرزدەبێتەوە و لێوەکانیش خڕ دەبن | پیتی یاء ( ي ) (الياء المدّية) ناوەڕاستی زمان بەرز دەبێتەوە |
|---|---|---|










---

(1)(یر) پیتە نامەدییەکان (و، ی) زیاتر کار دەکەوێتە سەر دەرچە دەستنیشانکراوەکان، واتە بۆ خوێدنەوەی پیتی (واو)هێز دەدەینە لێوەکان، بۆ خوێندنەوەی پیتی(یاء)یش، هێز دەدەینە ناوەراستی زمان.
- پیتە مەدییەکانی(و، ی) زیاتر کار دەکەوێتە سەر بۆشایی دەم و گەروو (الجوف).

## ﴿ پیتە لاوەكییەكان (الحروف الفرعية) ﴾

**پیتە لاوەكییەكان (الحروف الفرعية):** بریتین لە ژمارەیەك پیت, جگە لە پیتە ڕەسەنەكان, (پیتە ئەبجەدی و هجائی)یەكان, هیچ وێنەیەكی تایبەتیان نییە، هەر وەك پیتە سەرەكییەكان دەنوسرێن, بەڵام خوێندنەوەیەكی تایبەتیان هەیە, چونكە لە نێوان دوو دەرچەدا دەخوێندرێنەوە, هەندێك لەو پیتانە لە هەمان دەرچەی پیتە ڕەسەنەكان دەردەچن, بەڵام بە شێوازەكی جیاواز دەخوێندرێنەوە[1] زانایانی زمان و تەجوید لەسەر ژمارەی ئەو پیتانە كۆك و یەكدەنگ نین, لەو زانایانە:

ئ- (سيبويه و مكي ابن أبي طالب) دەڵێن: پێنج پیتن: (هەمزەی سووك ، ئەلیفی لار (ئیمالە) ، صادی ئیشمام ، یائی ئیشمام ، نونی ئیخفاء)

ب- (ئیمامی جەزەری) دەڵێت: پێنج پیتن: (هەمزەی سووك ، ئەلیفی لار، صادی ئیشمام ، ئەلیفی قەڵەو، لامی قەڵەو).

ج- (ملا على القارئ) دەڵێت: پێنج پیتن: (هەمزەی سووك ، ئەلیفی لار ، صادی ئیشمام، نونی ئیخفاء، لامی قەڵەو).

د- (محمد مكي) و ئیمامی (الطّيبي) دەڵێن: هەشت پیتن: (هەمزەی سووك، ئەلیفی لار، صادی ئیشمام، یائی ئیشمام[××]، ئەلیفی قەڵەو، لامی قەڵەو، نونی ئیخفاء، میمی ئیخفاء)

بەشێوەیەكی گشتی, ئەگەر گشت پیتەكانی هەموو ئەو زانایانە كۆبكەینەوە، بۆمان دەردەكەوێت, كە ژمارەی پیتە لاوەكییەكان هەشتن، بەلام تەنیا شەش پیت لەم هەشت پیتانە لە ریوایەتی (حفص)دا دەخوێندرێنەوە, كە بریتین لەمانە:

ئ- (ء): (هەمزەی سووك) وەكوو: ﴿ ءَاْعۡجَمِيّٞ , ءَاْللَّهُ ﴾ لە نێوان هەمزە و پیتی (مەددە) (ئەوەی سەر بە حەرەكەی هەمزە)یە دەخوێندرێتەوە.

---

([1]) شێخ (زكريا الانصارى) دەڵێت: پیتە لاوەكییەكان لە دوو پیت دروست بوون و لە نێوان دوو دەرچەدا دەردەچن، بەڵام شێخ (عمر بن إسماعيل المُسْعَدي(ت□ترىرتره) دەڵێت: پیتە لاوەكییەكان وەك پیتە سەرەكییەكان نین، بەڵام لە پیتە سەرەكییەكان دروست بوون و بە شێوازێكی جیاواز دەخوێندرێنەوە.

[××] هەردوو پیتی (صادی ئیشمام و یائی ئیشمام) دوو پیتیی لاوەكین, بەلام لە ریوایەتی (ئیمام حفص) ناخوێندرێنەوە

ئ- **صادی ئیشمام:** بە ئاوێتەكردنی پیتی (صاد) لەگەڵ پیتی (زای) دەخوێندرێتەوە , وەكوو: ﴿ٱلصِّرَٰطَ, أَصۡدَقُ﴾ هەروەك لەخوێندنی (حمزة)دا هاتووە.

ب- **یائی ئیشمام:** بەئاوێتەكردنی (واو) لەگەڵ (ياء)دەخوێتدرێتەوە, وەكوو: ﴿ قِيلَ, وَغِيضَ ..... ﴾ هەروەك لەخوێندنی (هشام, كسائي . ... ) دا هاتووە.

یر- (ا): (ئەلیفی لارکراو) لە نێوان ئەلیف و یائدا دەخوێندرێتەوە, وەکوو: ﴿ مَجۡرِىٰهَا ﴾

سم- (ا): (ئەلیفی مەددە)کاتێك بەقەڵەوی دەخوێندرێتەوە, کە شێوازەکی تایبەتە, کۆتایی زمان بەرزدەبێتەوە نەك لەسەر ڕەسەنایەتی خۆی, کە پێویستە زمان لە خوارەوە بێت,
وەکوو: ﴿ الصَّاخَّةُ, قَالَ, وَخَاصَمَهُمَا﴾

شم- (ل): (لامِ قەڵەو)[1] چونکە لام لەبنچینەدا سووکە، بۆیە لەکاتی قەڵەوکردنی لەگەل ناوی ﴿ٱللَّه﴾, کۆتایی زمان بەرز دەبێتەوە بۆ دەرچەی پیتە قەڵەوەکان.

لھ-(ن):(نونی ئیخفائکراو)لە نێوان دەرچەی نون و دەرچەی پیتی ئیخفائدا دەخوێندرێتەوە،
وەکوو: ﴿ الإنسَانَ , أن كَانَ , وَمَن تَابَ ﴾

- (م): (میمی ئیخفائکراو) لە نێوان دەرچەی میمی (الخیشوم) و دەرچەی پیتی (باء)دا (دیوی ناوەوەی لێوەکان) دەخوێندرێنەوە،
وەکوو: ﴿ تَرۡمِيهِم بِحِجَارَةٍ ، يَوۡمَ هُم بَٰرِزُونَ ﴾

**زانیاری**

سەروژێر(الحرکات), لەگەڵ پیتە لاوەکییەکانیشدا هەن, پێی دەڵێن: سەروژێرە لاوەکییەکان (الحرکات الفرعیە), لە ڕیوایەتی (حفص)دا تەنیا (فەتحە) لە سەر و ژێرە لاوەکییەکان هەژمار دەکرێت ئەویش لەپێش ئەلیفی لارکردنەوە هاتووە, وەکوو: وشەی ﴿مَجۡرِىٰهَا﴾, فەتحە لە نێوان فەتحە و کەسرەدا دەخوێندرێتەوە.
ئیمامی (الطیبي) دەڵێت[2]:

والحركات وردت أصلية ...... وهي الثلاث وأتت فرعية
وهي التي قبل الذي أُميلا ...... وكسرةٍ كضمةٍ كقيلا

---

[1] لامی وشەی (ٱللَّه) لە گشت جۆرەکانی خوێندنەوەدا، بەقەڵەوی دەخوێندرێتەوە, بەپێی مەرجەکانی, بەلاّم لە ڕیوایەتی ئیمام (ورش)دا, لامی دوای پیتەکانی (ص , ط , ظ) بەقەڵەوی دەخوێندرێتەوە, وەکوو: (الصَلَوٰةَ, أَظۡلَمُ, ٱلطَّلَٰقُ)، بەلاّم بەپێی مەرجەکانی ڕیوایەتەکەی.

[2] منظومة المفيد في التجويد.

## پیته بچووكه‌كان له‌ قورئاندا

له قورئانی پیرۆزدا شه‌ش پیتی ڕه‌سه‌ن هه‌ن، هه‌ندێك جار به‌بچووكی و هه‌ندێك جاریش به‌گه‌وره‌یی نووسراون، كه ئه‌مانه‌ن: ( ء ، ، و ، ن ، س ، یاء(ے) )،كه له وشه‌ی (أَوَنَسِيَا)دا، كۆمانكردوونه‌ته‌وه، ئه‌م پیتانه له بنچینه‌دا له‌گه‌ڵ دابه‌زینی قورئان له هه‌ندێك وشه‌دا نه‌نووسراون، به‌ڵام ده‌خوێندرانه‌وه، بۆیه له‌پێناو پاراستنی ئه‌و وشانه له خوێندنه‌وه‌یه‌كی هه‌ڵه و ناڕاست، زانایان ئه‌و پیتانه‌یان به‌شێوه‌یه‌كی بچووك له قورئاندا نووسیون، به‌م شێوه‌یه‌ی خواره‌وه:

1- ( ، ن ، و ، ء ، ے): كاتێك یه‌كێك له‌م پیتانه له نێو دوو پیتدا هاتبێت، ئه‌وا ئه‌و واتایه ده‌به‌خشێت كه ئه‌م پیته له نووسیندا سڕاوه‌ته‌وه، به‌ڵام له‌گه‌ڵ هه‌ردوو پیته‌كه‌ی پێش خۆی و دوای خۆی ده‌خوێندرێته‌وه, بۆ نموونه:

| | |
|---|---|
| ألف: ﴿وَٱلْعَٰدِيَٰتِ ، مَٰلِكِ ، ٱلصَّلَوَٰتِ﴾ | یاء: ﴿ يحۦي ، إِۦلَٰفِهِمْ ، إِبْرَٰهِۧمَ ﴾ |
| واو, نون: ﴿ داوۥد ، يَلْوۥن ، نُۨجِي ﴾ | همزة: ﴿ٱلْـَٔافِلِينَ، ٱلْـَٔازِفَةِ ، بِـَٔاخِذِيهِ﴾ |

یر- ئه‌گه‌ر هه‌ر یه‌ك له پیته‌كانی (ء ، ا ، س) له‌سه‌ر پیتێكی دیكه نووسرابێت, نیشانه‌ی ئه‌وه‌یه پیتی خواره‌وه ناخوێندرێته‌وه و پیتی بچووكی سه‌ره‌وه‌ش ده‌خوێندرێته‌وه, بۆ نموونه:

| | |
|---|---|
| ﴿وَزَادَكُمْ فِي ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةً﴾ الاعراف- ني | ﴿فَٱدَّٰرَءْتُمْ فِيهَا﴾ البقرة: یریي |
| ﴿نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ﴾ الشعراء: سمني‌تر | ﴿بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ﴾ الكهف: تيير |
| ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ النور: له | |

سم- ئه‌گه‌ر پیتی (س) له‌ژێر پیتی (ص) نوسراوبێت, ئه‌وا دروسته ئه‌و وشه‌یه به هه‌ردوو پیت بخوێندرێته‌وه, به‌ڵام به (صاد) بخوێندرێت باشتره, وه‌كوو: ﴿أَمْ هُمُ ٱلْمُصَۣيْطِرُونَ﴾

## جیاوازیی لە نێوان پیتی (ضاد)و پیتی (ظاء)

هەندێك خوێنەر, پیتی (ضاد)وەك پیتی (ظاء) دەخوێننەوە, ئەمەش لە هەڵە مەزنەكانە، چونكە ئەم دوو پیتە لە خوێندنەوە و نووسیندا لێكجیاوازن و واتایەكەی دەشێوێنێت.

### جیاوازیی لە نێوان هەردوو پیتی (ض , ظ)

أ- جیاوازیی لە نووسیندا: ئەم دوو پیتە لە نووسیندا وەك یەك نین(ض - ضاد)(ظ - ظاء).

ب- جیاوازیی لە دەرچەدا: پیتی (ضاد) لە لایەكی زمان لەگەڵ ریزە ددانەكانی سەرەوە دەردچێت, بەڵام (ظاء) لە سەری زمان لەگەڵ سەری ددانەكانی پێشەوەی دەم دەردەچێت.

ج- جیاوازیی لە سیفەتەكاندا: سیفەتی (استطالة) لە پیتی (ض)دا دەخوێندرێتەوە, بەڵام لە پیتی (ظ)دا ناخوێندرێتەوە.

د- جیاوازیی لە واتادا: ئەگەر نووسین و خوێندنەوەی هەردوو پیتەكە هاوشێوە نەبێت, ئەوا هەر پیتێك واتایەك بەو وشەیە دەبەخشێت كە تێیدا نووسراوە،

نموونەأ: ﴿فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ﴾ واتای (ضَلَّ) ون بوو، بەڵام كە (ظَلَّ)دەخوێندرێتەوە, واتە بەردەوام بوون یان مانەوە لە شوێنی خۆی.

نموونا ب: ﴿وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ ٢٢ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٞ ٢٣﴾

وشەی ﴿نَاضِرَةٌ﴾ واتاكەی: ڕوخسارێكی گەش.

وشەی ﴿نَاظِرَةٞ﴾ واتاكەی: ڕوویان لە پەروەردگارە.

نموونەج: ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾

ٱلضَّآلِّينَ ﴾ واتاكەی: ئەوانەی ڕێگایان ون كردووە.

(الظَّآلِّينَ) ئەوانەی لە شوێنی خۆیان ماون.

ئیمامی جەزەری پوختەی لێكجیاكردنەوەی ئەم دوو پیتەی لەم دوو دێڕە شیعردا گوتوویەتی:

والضَّادَ بِاستِطَالَةٍ وَمَخرَجِ ...... مَيِّزْ من الظَّاءِ وَكُلُهَا تَجي(1)

بەدیاركەوت, كە لێكگۆڕینی ئەم دوو پیتە (ض ، ظ) یەكێكە لە هەڵە حەرامەكان، چونكە دەبێتە هۆی گۆڕینی واتای ئایەتەكانی قورئان, بە تایبەتی لێكگۆڕینی ئەم دوو پیتە لەكاتی خوێندنەوەی (سورة الفاتحة)دا, هەروەك هەندێك زانا دەڵێن دوور نییە نوێژ بەتاڵ بكاتەوە.

---

(1) المقدمة الجزرية/ل ب

## سەروژێر (الحركات)

سەروژێر(الحركات): هەندێك نیشانەن, لەسەرو ژێری پیتەکان دانراون, جا چ نیشانەی (إعراب)بن یان (بناء)بن تاکوو دروست بخوێندرێنەوە و هیچ واتایەکی هەڵە نەبەخشێت, ئەم نیشانانەش لەلایەن ئەم زانایانەی خوارەوە دانراون:

ترـ (أبو الأسود الدؤلي، تني□ه) سەروژێر (حركة)ی ب شێوەی خاڵی سوور وەك نیشانە بۆ(فەتحە و (ضمة) و کەسرە و غوننە)[1] لەسەرەوە و ژێرەوەی پیتەکان داناون, بە فەرمانی والی بەصرە (زیاد بن أبیه، تسملهه), هەروەها هەندێك دەڵێن بە فەرمانی (علي بن أبي طالب)بووە.

سمـ زانای بەناوبانگ(الخليل بن أحمد الفراهيدي, بربرتر-بربيترهـ)هەستاوە بە دروستکردنی پیتی(ء) لە سەری پیتی(ع) و دروستکردنی وێنەی شەددە( ّ ) و وێنەی سکون ( ْ ) و گۆڕینی خاڵەکانی شیکردنەوە(إعراب) بۆ ئەم وێنەیەی کە ئێستا لەسەر پیتەکان هەیە, بەم شێوەیەی خوارەوە:

**الفتحة**: (خەتێك), کە لەبنچینەدا ئەلیفێکی ڕاکشاو و بچووکی لەسەر پیتەکە داناوە (كَ).

**الكسرة**: (خەتێك), کە لەبنچینەدا یائێکی بچووك و سووڕاو( ے ) لە ژێر پیتەکەی دانابوو, بەڵام ئێستا سەرەکەی بڕاوە ( كِ ).

**الضّمّة**: واوێکی بچووکە, لەسەر پیتەکە دانراوە ( كُ ).

**الشّدة**: سەری پیتی (ش) لە وشەی (شدید)ە, بەبێ خاڵ دادەنرێت, لەسەر ئەو پیتانەی کە لە دوو پیت پێکهاتوون (لّ , كّ)

**السّكون**: سەری پیتی (خ), لە وشەی(خفیف)ە و بەبێ خاڵ ( ْ ) لەسەر پیتەکەی داناوە (كْ).

**التّنوين**: دوو فەتحە و دوو کەسرە و دوو(ضمة), (ـً ـٍ ـٌ)لە سەرەوە و ژێرەوەی پیتەکە دایناون.

---

[1] المحكم في نقط المصاحف:(ص□ير-□ير)

## خوێندنەوەی سەروژێرەکان (الحركات)

خوێندنەوەی سەروژێر(الحركات)، بەشێوەکی دروست، دەبێتە هۆی پاراستنی واتای وشە و ئایەتەکە و ئەو واتایە دەبەخشێت کە پەروەردگار مەبەستیەتی، بۆیە پێویستە دەنگەکانیان تێکەڵ نەبێت و ماوەکەشیان بەتەواوی بخوێندرێتەوە (نە کورت بێت، نە درێژ).

هەروەك (الامام الطِّيي) دەڵێت[1]:

وَعِند نُطقِ الحَركاتِ فاحْذَرا ....... نَقصًا أو اشْباعًا أو انْ تُغيِّرا
بمزْجِ بعضِها بِصوتِ بعض ....... أو بِسكونٍ فَهْوَ غَيرُ مُرْضِ

هەروەها دەڵێت:

وَكُلُّ مَـضْمُـوم فَلَـنْ يَتِـمَّا ...... إِلّا بِضَمِّ الشَّـفَتَيْنِ ضَـمَّا
وَذُو انْخِفَاضٍ بِأنْخِفَاضٍ لِلْفَمِ ......يَتِمُّ وَالْمَفْتُوحُ بِالْفَتْحِ افْهَمِ

يەكەم- خوێندنەوەی فەتحە:

يەكەم- پێویستە دەم کراوە بێت و زمانیش لە خواریەوە بێت و دەنگی فەتحەش لەگەڵ دەنگی کەسرە یان یاء ئاوێتە نەبێت, وەکوو: ﴿غَرَبَتْ, نُسِفَتْ, حَامِيَةً﴾

دووەم- پێویستە دەنگی فەتحە لەگەڵ دەنگی(واو) ئاوێتە نەبێت, لە کاتی خوێندنەوەی پیتە قەڵەوەکانی, وەکوو: ﴿خَيرًا ، وَلَقَدْ ، خَالِدِينَ ﴾

سێيەم- پێویستە دەنگی فەتحە لەگەڵ دەنگی سکون ئاوێتە نەبێت, وەکوو: ﴿ أَفْنَانٍ ، رَفْرَفٍ ﴾

دووەم- خوێندنەوەی بۆرە(ضمة):

يەكەم- پێویستە خوێنەر لێوەکانی خڕ بکاتەوە, بۆ دەرەوە, هەروەك خوێندنەوەی پیتی(واو).

دووەم- پێویستە دەنگ (ضمة), بەرەو فەتحە نەڕوات, وەکوو: ﴿ إِنَّكُمْ ، بِأَنَّهُمْ ﴾

سێيەم- پێویستە دەنگی (ضمة) لەگەڵ دەنگی کەسرە ئاوێتە نەبێت, وەکوو:
﴿ قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ ﴾ (التوبةةشمير)

چوارەم- پێویستە دەنگی (ضمة) لەگەڵ دەنگی سکون ئاوێتە نەبێت, وەکوو:
﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ٥ ﴾ ﴿ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ ﴾ (النحل:ني)

سێيەم- خوێندنەوەی کەسرە:

يەكەم- پێویستە ناوەڕاستی زمان بەرز ببێتەوە, بۆ دەرچەی پیتی یاء و دەنگی پیتەکە بێتە خوارەوە.

دووەم- پێویستە دەنگی کەسرە لەگەڵ دەنگی فەتحە ئاوێتە نەبێت, وەکوو: ﴿ تُرِيدُ ، فَوَرَبِّكَ ﴾

سێيەم- دەنگی کەسرە لەگەڵ دەنگی سکون ئاوێتە نەبێت, وەکوو: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾﴿ٱهْدِنَا﴾

چوارەم- خوێندنەوەی سکون: پیتی ساکن دەخوێندرێتەوە بە بەریەککەوتنی دەرچەکەی.

پێنجەم- خوێندنەوەی تەنوین: بریتییە لە خوێندنەوەی نونێکی ساکن لەگەڵ جووڵەی کۆتایی وشەکە، کە وێنەکەی دووبارە دەبێتەوە, وەکوو: ﴿ عَلِيمٌ , نِدَاءً , صِرَاطٍ﴾

---

(1) منظومة المفيد في علم التجويد/ باب الحركات الثلاث والسكون/سه،شه، لهتر،

## نازناوی پیتەکان (ألقاب الحروف)

ژمارەیەك نازناون, بۆ پیتەکان دانراون, بەهۆی ئەو شوێنەیان کە لەوێوە دەردەچن, تاکوو پیتەکە بەئاسانی بناسرێتەوە و دەرچەکەی بەئاسانی بزانرێت.

زانای بەناوبانگ لە زماندا (الخليل بن احمد الفراهيدي), لە کتێبەکەیدا, دە نازناوی[1] بۆ پیتەکانی زمانی عەرەبی داناوە, بەپێی ئەو دەرچانەی لەوێوە دەردەچن, ئەوانیش ئەمانەن:

**تر– پیتە گەرووەکان (الحروف الحلقية):** بەو پیتانە دەگوترێت, کە لە گەرووە دەردەچن، کە بریتین لەم شەش پیتە:( ء ، هـ ، ع ، ح ، غ ، خ )

**یر– پیتە هەوایەکان (الحروف الهوائية):** بەو پیتانە دەگوترێت, کە لەگەڵ هەوای دەمەوە دەردەچن و هیچ دەرچەیەکی دەستنیشانکراویشیان نییە، ئەوانیش پیتە مەددییەکانن:( ا ، و ، ي )

ئەلیف, پێشەوەی فەتحە بێت.

واو, پێشەوەی بۆر (ضمَة) بێت.

یاء, پێشەوەی کەسرە بێت.

**□– پیتە پشکەمەلاشووەکان: (الحروف اللَّهوية):** بەو پیتانە دەگوترێت, کە لە نزیك پشکەمەلاشوو(اللُّهاة)ە دەردەچن، کە بریتین لەم دوو پیتانە: ( ق ، ك )

**٤– الحروف الذَّلقية:** ئەو پیتانەن کە لە پێشەوەی زمان دەردەچن, کە تۆزێك لە پشتی زمانیشی لەگەڵدایە، کە بریتین لەم سێ پیتانە: ( ل ، ر ، ن )

**له– الحروف النِّطعية:** بەو پیتانە دەگوترێت, کە لە پێستی ئەستووری مەلاشووی دەمەوە دەردەچن لە پشت پووکەکانی ددانەکانی سەرەوە, لەگەڵ پێشەوەی زمان،
کە بریتین لەم سێ پیتانە: ( ط ، ت ، د )

---

(تر) الرعاية لتجويد القراءة: (صلهترترشمشمتر)؛ هداية القاري الى تجويد كلام الباري: (صتربيشمبي)

- **الحروف الأسلية**: بەو پیتانە دەگوترێت, کە لە سەری زمانەوە دەردەچن, بـەڵام پشـتی زمـان لەگـەڵی بکارناهێنرێـت, هـەروەك لەگـەڵ(الحـروف النطعيـة)و(الحـروف الذلقية)بەکاردەهاتن، کە بریتین لەم سێ پیتانە: (س، ص ، ز).

٧-**الحروف الشَّجْرِية**: بەو پیتانە دەگوترێت, کە لە ناوەڕاستی دەمەوە دەردەچن واتە لە نێوان هەردوو ڕێگا (ڕییا) و ناوەڕاستی زمان، کە بریتین لەم پیتانە: ( ج ، ش ، ي ), هەروەها پیتی ( ض )ش[1] لـە پیتـەکانی ئـەم نازناوەیـە, ئەگـەر بـە هەردوو لای زمانەکە بخوێندرێتەوە.

- پیتــە پووکییــەکان (الحــروف اللِّثويــة): بــەو پیتانــە دە گوترێــت, کــە دەخوێندرێنەوە, دەنگ و هەوایان بەر پووکی ددانەکانی سەرەوە دەکەوێت، کە بریتین لەم سێ پیتانە:(ظ ، ث ، ذ).

- پیتــە لێوییــەکان (الحــروف الشَّــفوية): بــەو پیتانــە دەگوترێــت, کــە لــە لێوەکانەوە دەردەچن، کە بریتین لەم چوار پیتانە: ( م ، ب ، و ، ف ).

- پیتـە بۆشـاییەکان ( الحروف الجوفية): بـەو پیتانـە دەگوترێـت, کـە لـە بۆشایی دەم و گەروو دەردەچن، ئەوانیش ئەم پیتە مەددییانەن: ( ا ، و ، ي )

(1) پیتی (ضاد) لە پیتە (شجرية)ەکان هەژمار دەکرێت, هەروەك ئیمام (الجزری)لە پەرتووکەکەیدا بەناوی التمهيد في علم التجويد:(ص لهني)دا ئاماژەی پێداوە و ئیمام (السمنودی)ش لە شیعرەکەیدا (لآلئ البيان في تجويد القرآن) دەڵێت:

والجـيم والشّـين ويا لُقِّبت ...... مع ضادها شجـرية كما ثبت

# سیفەتی پیتەکان (صفات الحروف)

سیفەت (الصفة) لەڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە ناسینی شتێك بە هەستکردن, وەك: بە (ڕەنگەکان یان درێژی و کورتی...هتد), یان ناسینی مەعنەوی, وەك:(زانستی یان ڕەوشتی)[1].

سیفەتەکانی هەستکردنی پیتەکان(استعلاء و استفالة ..هتد)ومەعنەوییەکان (التفخيم و الترقيق..هتد)

لەڕووی زاراوەوە: بریتییە لە چۆنیەتی خوێندنەوەی هەر پیتێك لە دەرچەکەی خۆیدا.

## سوودەکانی خوێندنی سیفەتەکان لەگەڵ پیتەکان[2]:

١- تاکوو پیتەکان بەدروستی بخوێندرێنەوە و هیچ کەموکورییەکی تێنەکەوێت.

٢- تاکوو پیتەکان لێکجیا بکرێنەوە, بە تایبەتی ئەو پیتانەی لە یەك دەرچە دەردەچن، وەکوو: (ط ، د ، ت ) یان ( ظ ، ذ ، ث ) یان(ص, ز, س).

٣- تاکوو پیتە بەهێز و بێهێزەکان بناسرێنەوە، پاشان بۆ ئەوەی یاساکانی تەجوید دروست لەگەڵیاندا بخوێندرێنەوە.

### سیفەتی پیتەکان

#### أ- سیفەتە پێویستەکان (الصفات اللّازمة)

##### ١- سیفەتە هاودژەکان (صفات لازمة لها ضد)

١- الجَهر ⟷ الهَمس

٢- الشِّدَة ⟷ البينيَّة ⟷ الرِخاوَة

☐- الأستعلاء ⟷ الأسْتفالة

٤- الأَطْبَاق ⟷ الأَنفتاح

٥- الأَصْمات ⟷ الأَذْلاق

##### ٢- سیفەتە ناهاودژەکان (صفات لازمة ليس لها ضد)

١- مینگە (الغنة)

٢- دەنگتیژی (الصَّفير)

٣- نەرمی (اللِّين)

٤- دووبارەکردنەوە (التَّكرير)

٥- لادان (الانحِراف)

☐- درێژخوازی (الاسْتطَالة)

☐- درێژکردنەوە یان لێککێشان (المد)

٨- ون بوون (الخفاء)

٩- بڵاوبوون (التَّفَشي)

#### ب- سیفەتە کاتییەکان (الصفات العارضة)

---

(1) هداية القاري: (ج1/ص[illegible])

(2) هداية القاري: (ج1/ص[illegible])؛ أحكام قراءة القرآن الكريم: (ص[illegible])

## ج- سیفەتە پێویست و هاودژەکان

١- (الهمس) لەڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە دەنگنزمی.
لەڕووی زاراوەوە: دەرکەوتنی هەناسەیە لەگەڵ خوێندنەوەی پیتەکە, پەردەکانی دەنگ نالەرن و دەنگیان لێ نایەت(هەناسەکە زاڵە بەسەر دەنگەکەدا).پیتەکانی هەناسە ئەمانەن: (ف، ح، ث، هـ، ش، خ، ص، س، ک، ت)(فحثه شخص سكت).

(الجهر) لەڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە دەنگبەرزی.
لەڕووی زاراوە (اصطلاحا)وە: دەرکەوتنی دەنگە لەگەڵ پیتەکە، چونکە پەردەکانی دەنگ بەریەکدەکەون و دەلەرن و ڕێگا لە هەناسە دەگیرێت, واتە هەناسەیەکی زیاد لەگەڵ خوێندنەوەی پیتەکە ناچێتە دەرەوە (دەنگی پیتەکە زاڵە بەسەر هەناسەکەدا)پیتەکانی ئەم سیفەتە: ئەو پیتانەی کە ماون, جگە لە پیتەکانی هەناسە, وەکوو: (ق ، ط ، م ، ز ، ذ...)

### وێنەی دەم بۆ خوێندنەوەی سیفەتەکانی (الجهر) و (الهمس)

خویندنەوەی پیتە هەناسەدارەکان (الهمس): وەك پیتی (سین) لەم وێنەیەدا




خویندنەوەی پیتە دەنگدارەکان (الجهر): وەك پیتی (زاي) لەم وێنەیەدا

نموونة

﴿لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَهُمۡ وَهُمۡ لَهُمۡ جُندٞ مُّحۡضَرُونَ﴾ (يس:)
(لهي)

﴿وَلَوۡ أَنَّ لِكُلِّ نَفۡسٖ ظَلَمَتۡ مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ لَٱفۡتَدَتۡ بِهِۦۗ﴾ (يونس:)
(شمەلە)

ب- (الاستعلاء) لەڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە بەرزبوونەوە.

لەڕووی زاراوەوە: بەرزبوونەوەی دەنگی پیتەکەیە بۆ مەلاشووی دەم، چونکە کۆتایی زمان بەرز دەبێتەوە و گەروو تەسك دەبێت و ناوەندی زمانیش قوولْ دەبێتەوە, بۆیە دەنگەکە لە نێوان زمان و مەلاشووی دەم دەنگدەداتەوە و قەڵەو دەبێت.

پیتەکانی بریتن لە: (خ ، ص ، ض ، غ ، ط ، ق ، ظ) (خُصَّ ضَغطٍ قِظ).

(الاستفالة) لەڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە نزمبوون.

لەڕووی زاراوەوە: نزمبوونی دەنگی پیتەکەیە، چونکە کۆتایی زمان نزم دەبێتەوە و گەروو فراوان دەبێت و سەری زمان دێتە خوارەوە, بۆیە دەنگی پیتەکە سووك دەبێ و ئاسان لە دەم دەردەچێ, پیتەکانیشی: (گشت ئەو پیتانەن کە ماون, جگە لە پیتە بەرزەکان)، وەك: (س ، م , ج، ت ، د ,....هتد)

وێنەی دەم بۆ خوێندنەوەی سیفەتەکانی (استعلاء) و (استفالة)




نموونة

﴿ لَقَدۡ كَانَ فِي قَصَصِهِمۡ عِبۡرَةٞ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِۗ ﴾ (يوسف: ١١١)

﴿ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِن نُّطۡفَةٖ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٞ مُّبِينٞ ﴾ (النحل:٤)

٣- (الشِّدة) لەڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە دەنگتوندی.
لەڕووی زاراوەوە: ڕێگرتنە لە دەنگی پیتەکە, واتە لەگەڵ خوێندنەوەی پیتەکە, دەرچەکە دادەخرێت و دەنگی پیتەکە نایەتە دەرەوە، پیتەکانیشی بریتین لە:
(أ، ج، د، ق، ط، ب، ک، ت) ئەم پیتانە لە ڕستەی: (أجد قط بكت), کۆکراونەتەوە.

نموونة

﴿ تَأۡلَمُونَ , قَالَتۡ ، أَحَدٌ ، ٱلۡحَجَّ ، كَذِكۡرِكُمۡ ﴾

(الرِخاوة) لەڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە خاوی.
لەڕووی زاراوەوە: دەرکەوتنی دەنگی پیتەکەیە بەبەردەوامی, جا چ پیتی بەشەددە یان بێ شەددە بێت, وەك: (يّ، ذّ)(ي، ذ), چونکە ڕێ بۆ دەنگی پیتەکە کراوەیە, پیتەکانیشی: گشت ئەو پیتانەن کە ماون, جگە لە پیتە بەهێز و ناوەندەکان,
(ص, س, ح, ي, ز, ض, ش, ... هتد)

نموونة

﴿ إِيَّاكَ ، وَٱلذَّٰرِيَٰتِ , ٱلۡعَزِيزُ ، بِإِذۡنِهِ , تَهۡوَى , فَٱسۡتَوَىٰ ﴾

وێنەی دەم بۆ خوێندنەوەی سیفەتەکانی (الشدة) و(الرخاوة)







زانیاری

بۆ کردنەوەی ڕێگا لە دەنگە توندەکان:
ﭢ- ئەم پێنج پیتە (ق، ط، ب، ج، د) بە قەلقەلە دەخوێندرێنەوە.
ﯾﺮ- ئەم دوو پیتە (ک ، ت) بە هەناسە دەخوێندرێنەوە.
سم- پیتی(ء) بە( إبدال ، تسهيل ، حذف ، نقل ) دەخوێندرێتەوە.

(**البَينِيَّة**) لەڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە مامناوەند.
لەڕووی زاراوەوە: خوێندنەوەی پیتە لە نێوان دەنگ توندکردن و خاوکردنەوە,
چونکە دەرچەی پیتەکە لە دەنگەکە دانەخراوە, هەموویشی کراوە نییە,
پیتەکانی ئەم سیفەتە ئەمانەن: (ل ، ن ، ع ، م ، ر) (لن عمر).

نموونە
﴿ يَجْعَلْ ، مِنْ هَادٍ , نَعْبُدُ , مَمْنُونٍ , وَأَشْرَرْتُ ﴾

## ت- سیفەتی مامناوەند لە پیتی (ع)




زمانەبچکۆڵە دەچێتە پشتەوە و ڕێگا
لەبەردەم دەنگی پیتەکە تەسك دەبێتەوە

## ی- سیفەتی مامناوەند لە پیتی (ن , م) دا

مامناوەند (البينيّة) لە پیتەکانی(ن, م) لەلایەك زمان ڕێ لە دەنگی پیتەکە دەگرێت, وەك پیتی توند, لەلایەکی تریشەوە, دەنگ لە لووتەوە دەردەچێ, وەك پیتی خاو.



## سم- سیفەتی مامناوەند لە پیتی (ر)دا






سیفەتی مامناوەند لە پیتی (ر), لەلایەکەوە پارچەیەك لە سەری زمان ڕێ لە دەنگی پیتەکە دەگرێت, بەڵام لەلایەکی دیکەوە دەنگەکەی لە بۆشایی سەری زمانەوە دەردەچێت.

## شم- سیفەتی مامناوەند لە پیتی(ل)دا






سیفەتی مامناوەند لە پیتی (ل), لەلایەکەوە پارچەیەك لە سەری زمان ڕێ لە دەنگی پیتەکە دەگرێت, بەڵام لەلایەکی دیکەوە دەنگەکەی لە هەردوو لای زمانەوە دەردەچێت.

شم- (الاطباق) لەڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە لکاوەیی.
لەڕووی زاراوەوە: دەنگی پیتەکە لەنێوان زمان و مەڵاشووی دەمدا کودەبێتەوە و گیردەبێت بەهوی بەرزبوونەوەی بەشی زیاتری زمانەکە بۆ مەڵاشووی دەم, بۆیە پیتەکە لە گشت پیتەکانی دیکە قەڵەوتر دەخوێندرێتەوە
پیتەکانی بریتین لە: (ص ، ض ، ط ، ظ)

(الانفتاح) لەڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە لێبوونەوە.
لەڕووی زاراوەوە: دەنگی پیتەکە لەنێوان زمان و مەڵاشووی دەمدا گیرنابێت, بە هۆی دوورکەوتنەوەی بەشە زۆرەکەی زمان لە مەڵاشووی دەم, بۆیە پیتەکە لە پیتەکانی (الاطباق) سووکتر دەخوێندرێنەوە.
.پیتەکانی بریتین لە: (گشت ئەو پیتانەی کە ماون)( ش، ن ، ف ، ......).

**جیاوازیی لە نێوان پیتی بەرز و پیتی توند و پیتی کراوەدا لەوێنەدا**

| پیتی بەرز و توند (إستعلاء وإطباق) | پیتی بەرز و کراوە (إستعلاء وإنفتاح) | پیتی نزم (إستفالة) |
|---|---|---|




لەم وێنەیدا بەدیارکەوت, ئەو پیتانەی لە گشت پیتەکانی دیکە قەڵەوتر دەخوێندرێنەوە, پیتەکانی (اطباق واستعلاء)ن, وەکوو: (عَصَي), ئینجا پیتەکانی ( استعلاء وانفتاح)ن, وەکوو: (قَالَ) پاشان پیتەکانی(استفال) بە سووکی دەخوێندرێنەوە, وەکوو: (النَّاسِ).

ئیمامی جەزەریش دەڵێت[1]:

وحَرفَ الاستعلاءِ فخِّم واخصُصَا ....... لاطبَاقَ أقوَى نَحو قَالَ والعَصَا

---

(1) المقدمة الجزرية/ لهشم.

لە- (الاذلاق) لەڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە سووککردن
لەڕووی زاراوەوە: بریتییە لە دەرکەوتنی پیت بە شێوەیەکی سووك و بەئاسانی، چونکە ئەم پیتە لە دیوی پێشەوەی دەم (سەرەتای زمان یان لێوەکان)ەوە دەردەچێت, پیتەکانی ئەم سیفەتە بریتین لە: (ف ، ر ، م ، ن ، ل ، ب)(فَرَّمِنْ لُب).

(الاصمات) لەڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە قورسکردن.
لەڕووی زاراوەوە: بریتییە لە دەرکەوتنی پیتەکە بەشێوەیەکی قورس، زانایانی زمان دەڵێن هەر وشەیەك لە چوار یان پێنج پیتی (اصمات)ی ڕەسەن پێکهاتبێت, ئەو وشەیە, وشەیەکی عەرەبی نییە, وەکوو وشەی (عسجد) ناوێکە لە ناوەکانی زێڕ, یاخود (عسطوس) ناوی دارێکە، بەڵام ئەگەر وشەی (رباعي وخماسي) عەرەبی بێت, پێویستە یەك لە پیتە (إذلاق)یەکانی تێدا بێت.
پیتەکانی (إصمات): (هەموو ئەو پیتانەی کە ماون, جگە لە پیتەکانی (اذلاق).

بۆ زانین : ئەم دوو سیفەتە (الاذلاق، الاصمات) لەگەڵ تەجوید ناخوێندرێنەوە, چونکە لە زانستی (صرف) هەژمار دەکرێن.

تێبینی

دەبێت خوێنەر وریا بێت, سیفەتی پیتەکان لە یەکتری نەگۆڕدرێن, وەکوو دەرخستنی هەناسە لەگەڵ پیتە دەنگییەکان, یان ڕێ گرتن لە دەنگی پیتە خاو و مامناوەندەکان, یاخود کردنەوەی ڕێگا لە دەنگی پیتە مامناوەندەکان, یاخود سووککردنی پیتە قەڵەوەکان یان قەڵەوکردنی پیتە سووکەکان, وەکوو:
﴿ إِيَّاكَ، نَعۡبُدُ، وَٱلذَّٰكِرِينَ، ٱلرَّحِيمِ، فَمَنِ ٱضۡطُرَّ، وَأَلَّوِ ٱسۡتَقَٰمُواْ، النَّاسِ، قَالَ ﴾

## سیفەته پێویست و هاودژەکان و پیتەکانیان

| سیفەته هاودژەکان | پیتەکانی سیفەته هاودژەکان |
|---|---|
| ۃ- پیته دەنگنزمەکان (الهمس) | ( ف ، ح ، ث ، هـ ، ش ، خ ، ص ، س ، ک ، ت ) (فحثه شخص سکت) |
| پیته دەنگبەرزەکان(الجهر) | بریتییه له هەموو ئەو پیتانەی که ماون, جگه له پیته (همس)ییەکان |
| یر- پیته دەنگ توندەکان (الشدَّة) | ( ء ، ج ، د ، ق ، ط ، ب ، ک ، ت ) (أجد قط بکت) |
| پیته مامناوەندەکان (البينية) | ( ل ، ن ، ع ، م ، ر ) (لن عمر) |
| پیته خاوەکان (الرخاوة) | بریتییه له هەموو ئەو پیتانەی که ماون, جگه له پیتەکانی (الشّدة والبينية) |
| سم- پیته بەرزەکان (الاستعلاء) | ( خ ، ص ، ض ، غ ، ط ، ق ، ظ ) (خص ضغط قظ ) |
| پیته نزمەکان (الاستفالة) | بریتییه له هەموو ئەو پیتانەی که ماون, جگه له پیتەکانی (استعلاء) |
| شم- پیته پێکەوەلکاوەکان (الاطباق) | ( ص ، ض ، ط ، ظ ) |
| پیته کراوەکان (الانفتاح) | بریتییه له هەموو ئەو پیتانەی که ماون, جگه له پیتەکانی (اطباق) |
| لهـ- پیته سووکەکان (الاذلاق) | ( ف ، ر ، م ، ن ، ل ، ب ) (فر من لب) |
| پیته قورسەکان (الاصمات) | بریتییه له هەموو ئەو پیتانەی که ماون, جگه له پیتەکانی (اذلاق) |

## ماوەی پیتەکان (أزمنة الحروف)

بۆ خوێندنەوەی هەر پیتێك ماوەیەكی هەیە, بەپێی دەرچە و سیفەتەكانی (الشده والرخاوه والبينيه) دەخوێندرێنەوە[1]:

**تر- پیته ساكنەكان:**

أ- پیته خاوەكان (حروف الرخاوة) بەیەك ئەندازە دەخوێندرێنەوە, وەكوو: (سْ = زْ = ظْ).

-پیته مامناوەندەكان(الحروف البينية)بەیەك ئەندازە دەخوێندرێنەوە, وەكوو:(لْ = مْ = عْ).

-پیته توندەكان (حروف الشّدة): بەیەك ئەندازە دەخوێندرێنەوە, وەكوو: (قْ = دْ = بْ).

ب- پیته خاوەكانی نا بزوێ(حروف الرّخاوة الصحيحة), لە پیته مامناوەندەكان(البينية) درێژتر دەخوێندرێنەوە, پیته مامناوەندەكانیش لە پیته توندەكان(الشدَّة) درێژتر دەخوێندرێنەوە، وەكوو: (أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ)(فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ)

**یر- پیته بەسەرو ژێرەكان:**

ماوەی خوێندنەوەی هەموو پیته(متحرك)ەكان بەیەك ئەندازە دەبێت, (كُتِبَ، عَلِمَ، فَخَرَجَ), نابێت كورت بخوێندرێت كە پێ دەڵێن(أختلاس) و هەروەها نابێت درێژیش بخوێندرێت, كە پێ دەڵێن(إشباع), وەكوو: (كُنتُم ⟵ كُونتم) (مِن و ال ⟵ مِين و ال)

**سه- پیته موشەددەدەكان:**

ئەم پیتانە بە ئەندازەی دوو پیت دەخوێندرێنەوە، چونكە لە دوو پیت پێكهاتوون, پیتێكی ساكن و پیتێكیش بەسەروژێر، پیته ساكنەكە بەپێی سیفەتی خاو و مامناوەند و توند دەخوێندرێتەوە, وەكوو: (وَٱلَّيْلِ، ٱلرَّحْمَٰنِ، السَّمَاء، الحَقُّ) جگە لە پیتەكانی (مّ، نّ), ماوەی خوێندنەوەیان, بەپێی خێرایی خوێندنەوە درێژتر دەبێت.

**شه- پیته مەددییەكان:**

ماوەی خوێندنەوەیان لە گشت پیتەكان درێژترە، بەڵام بەپێی جۆری مەددەكە و خێرایی خوێندنەوەكە.

**زانیاری**

هەر پیتێك مێزانێكی هەیە بۆ درێژكردنەوە و قەڵەوكردن و سووككردن, كە دەبێت خوێنەر زیادەڕەوی و درێغی لە دەرحەقیاندا نەكات, وەك ئیمامی(سخاوي)دەڵێت:

لِلحَرفِ مِيزانٌ فَلا تَكُ طَاغيا ....... فِيهِ وَلا تَكُ مُخسِرَ المِيزَانِ[2]

(1) التجويد المصور:(ص لهشمتر-بر لهتر)
(2) متن نونيه السخاوى/ له

## سیفەتە سەرەکییە ناهاودژەکان(1)

| الصّفير | اللّين | الغنّة | التّكرير | الانحراف | الاستطالة | المدّ | الخفاء | التّفشي |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|

ت-دەنگ تیژی (الصَّفير): دەنگێکی تیژ لەگەڵ پیتەکە دەردەچێت, بە هۆی تەسکبوونەوەی ڕێگای پیتەکە. پیتەکانی بریتین لە: (ص، ز, س) , پیتی (صاد) لە هەردووکیان بەهێزترە، چونکە یەکێکە لە پیتە (استعلاء، اطباق)یەکان, ئینجا پیتی (زاي), چونکە لە پیتە دەنگییەکانە (الجهر).

نموونة

﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثًا﴾ ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾ ﴿فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ﴾

ي- نەرمی (اللِّين): بریتییە لە هاتنەدەرەوەی پیتەکە بەئاسانی و نەرمی لە دەرچەی خۆیدا، پیتەکانیشی بریتین لە:( ي ، و )، بەڵام پێویستە ئەم پیتانە زەنندار (ساکن) بن و پیتی پێش ئەوانیش فەتحەی لەسەر بێت, کاتێك لەسەر ئەو وشەیە دەوەستین, کە پیتی نەرم, کەوتووەتە پێش پیتی کۆتایی, ئەوا پیتی نەرم دەبێتە مەددی نەرم(مد اللّين), بەڵام ئەگەر نەوەستین, تەنیا وەك پیتێکی نەرم دەخوێندرێتەوە.

نموونة

﴿لِإِيلَٰفِ قُرَيْشٍ﴾ ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ فَوْقَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ ﴿عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ﴾

---

(ت) پێویستە هەردوو سیفەتی (الغنة و الخفاء) بۆ سیفەتە ناهاودژەکان زیاد بکرێن, بە هۆی گرنگییەکەیان, هەروەك (عبد الفتاح المرصفی) لە پەرتووکی هدایه القاری دا: (ت / تێ) ئاماژەی پێداوە.

×× گرنگی مینگە (الغنه)، چونکە لە تەواوەتی هەردوو پیتی (ن ، م)ە, هەروەها لە سیفەتە پێویستەکانە بۆ ئەم دوو پیتە.

×× گرنگی ناسینی سیفەتی (الخفاء), تاکوو خوێنەر خۆی لێ بپارێزێت و پیتەکانی ئەم سیفەتە لە خوێندنەوەدا ون نەبن.

**سم- مینگە (الغُنَّة):** بریتییە لە سیفەتێکی پێویست بۆ هەردوو پیتەکانی(م ، ن)، لەگەڵ ئەم دوو پیتانە دەخوێندرێنەوە, بەهاتنەدەرەوەی هەندێك لە دەنگی ئەم دوو پیتانە لە بۆشایی لووتەوە, کە لەلایەکەوە دەبێتە هۆی تەواوکردنی ئەم دوو پیتانە, لەلایەکی دیکەشەوە, دەبێتە سیفەتی پیتەکانی (م , ن)




**تێبینی**

بۆشایی لووت دەرچەی دووەمی هەردوو پیتی (ن، م)ە, بەتایبەتی دەرچەی مینگە (الغنە)ی هەردوو پیتەکەیە، بۆیە پێویستە بزانین مینگە (الغنە) لە بنچینەدا پارچەیەکە لە هەردوو پیتی (ن، م), بەڵام لەڕووی درێژی و کورتی و قەڵەوی و سووکییەوە, دەبێتە سیفەتی هەردوو پیتەکە.

٤- دووبارەکردن (التكرير)[1] : بریتییە لە دووبارەکردنەوەی پیتەکە, بەهۆی لەرینەوەی بەشی پێشەوەی زمان، تەنیا پیتی را ( ر), هەڵگری ئەم سیفەتەیە.

٥- لادان (الانحراف)[2] : بریتییە لە لادانی دەنگی پیتەکە لە ڕێگا سەرەکییەکەی خۆی, چونکە پارچەیەك لە زمان ڕێ لە دەنگی پیتەکە دەگرێت، پیتی: (ل ، ر) هەڵگری ئەم سیفەتەن.

## جیاوازیی لە نێوان لادانی دەنگی پیتی (لام) و پیتی( راء) لە وێنەدا

**لادانی دەنگی پیتی (لام)**




**لادانی دەنگی پیتی (راء)**




---

(1) لای هەندێك لە زانایانی تەجوید, بۆیە ئەم سیفەتە دەدرێتە پاڵ ئەم پیتە, تاكوو پیتەكە دووبارە نەكرێتەوە, بەڵام ڕاستییەكەی ئەوەیە, هەروەك هەندێك زانای دیكە دەڵێن: پێویستە دووبارەكردنەوەیەكی سووك لەگەڵ (ڕاء)ەكە هەبێت. بەڵام نەبێتە هۆی ئەوەی زۆر (ڕاء)ی دیكەی لێی دەرچن, بە تایبەتی ئەگەر پیتی (راء) شەددەی لەسەر بێت, هەروەك ئیمامی جەزەری ئاماژەی پێداوە و دەڵێت: (وأخف تكريرا اذا تشدد)(المقدمه الجزريه/سشم).

(2) لەگەڵ پیتی (لام), دەنگی پیتەكە بۆ هەردوو لای زمانەكە لادەدات, بەڵام لەگەڵ پیتی (راء), دەنگی پیتەكە بۆ ناوەڕاستی سەری زمان لادەدات.

٦- درێژخوازی (الاستطالة)[١] : بریتییە لە پاڵنانی زمان لە پشتەوەی دەمەوە بەرەو پێشەوەی دەم, (بە هۆی پاڵەپەستۆی هەوا لەسەر زمان), تاکوو سەری زمان دەگاتە بنی ددانەکانی سەرەوە. پیتی (استطال)ە: بریتییە لە (ض).

دەنگی پیتەکە درێژ دەبێتەوە, بە هۆی پاڵنانی زمان بۆ پێشەوەی دەم, بەڵام درێژبوونەوەیەکی کەم و قورس، چونکە ڕێ لە دەنگی پیتەکە گیراوە. (ض) لە پیتە قەڵەو و لکاوەکانە(الاطباق).






ئەو شوێنەی سەری زمان بەئەستەم دەیگاتێ

ئەو شوێنەی پەستان لەسەر لێوار(ڕۆخ)ی زمان دروست دەکات

٧- درێژکردن (المد): بریتییە لە درێژکردن, یاخود لێکدەرهێنانی دەنگی پیتە مەددییەکان ( ا ، و ، ي )

بۆ زانین: لە بابەتی (مەددە)دا, بە بەرفراوانی قسەی لەسەر دەکەین.

٨- ون بوون (الخفاء): سیفەتێکە پیتەکە بێهێز دەکات و دەنگەکەی کەم دەکاتەوە یان ون دەکات و هەڵگرانی ئەم سیفەتەش بریتین لەم پیتانە:( ا ، و ، ي ، هـ ).

ئەم چوار پیتە ( ا ، و ، ي ، هـ ) بە سیفەتی(الخفاء) ناسراون, چونکە:

أ- دەرچەی (هاء) دوورە و هەموو سیفەتەکانیشی لاوازن, بۆیە سیفەتی ون بووی(الخفاء) بۆ دادەنرێت.

ب- پیتە مەددیەکان (ا، و، ی) بەم سیفەتە دەناسرێنەوە، چونکە دەرچەکەیان بەرفراوانە و دەستنیشانکراو نییە.

---

( ١) پیتی (ض) یەکەم پیتە لە زمانی عەرەبیدا دەرچەکەی لە شوێنی خۆی بجووڵێتەوە, کە پێی دەڵێن:(الاستطالة)، واتە ئەم سیفەتە لە دەرچەکەدا دروست دەبێت.

ی- بڵاوبـــوون (التفشـــي): بریتییـــە لـــە بڵاوبوونـــەوەی دەنگـــی پیتەکـــە لەگـــەڵ هەوایەکەی لە دەمـدا, چـونکە دەنـگ و هـەوای پیتەکـە بـەر ددانـەکان دەکـەوێت و بڵاو دەبێتەوە.

پیتی (ش), هەڵگری ئەم سیفەتەیە.




## جیاوازیی لە نێوان (المد) و (الاستطالة)دا

| ژ | المد (درێژکردن ) | الاستطالة (درێژخوازی) |
|---|---|---|
| ىَ | بریتین لەم سێ پیتانە: (ا ، و ، ي) | بریتییە لە پیتی (ض). |
| يێ | دەرچەی پیتە مەددییەکان دەستنیشاننەکراوە (مخرج مقدر). | دەرچەی پیتی (استطال) دەستنیشانکراوە (مخرج محقق). |
| سم | درێژکردنەوەی دەنگی پیتی مەددە بە شێوەیەکی نەرم و سووك، چونکە لە پیتە کراوەکانن (حروف الانفتاح). | درێژکردنەوەی دەنگی پیتی(ض) بە شێوەکی قورس، چونکە پیتەکە لکاوە(حرف الاطباق). |
| شم | سیفەتی (المدّ) لە ناو پیتی مەددەدا دەخوێندرێتەوە | سیفەتی درێژخوازی (إستطال), لە دەرچەدا دەخوێندرێتەوە |
| لە | سیفەتی مەددە, پیتی مەددە درێژ دەکاتەوە بە (یێ،سم،شم، لە، □) جووڵە (حەرەکە) | سیفەتی (إستطال), دەنگی پیتەکە بەرەو درێژی دەبات, بەپێی خێرایی خوێندنەوەکە |
| □ | درێژکردنەوەی پیتی مەددە لەسەر هەوای پیتەکە دەوەستێت | درێژخوازی (إستطالة), لەسەر دەنگی پیتەکە دەوەستێت |

## سیفەتە پێویستە ناهاودژەکان و پیتەکانیان
## (الصّفات اللازمة غير المتضادة)

| ثيتةكانيان | سيفةتة ناهاودذةكان |
|---|---|
| ( ص ، ز ، س ) | تر- دەنگتیژی (الصّفير) |
| ( ن ، م ) | ير- مینگە (الغنة) |
| ( و ، ي ) | ٣- نەرمی (اللّين) |
| ( ر ) | شم- دووبارەکردن (التّكرير) |
| (ل ، ر) | لھ- لادان (الانحراف) |
| ( ض ) | □- درێژخوازی ( الاستطالة) |
| ( ا ، و ، ي ) | □- درێژکردن (المدّ) |
| ( ا ، و ، ي ، هـ ) | تى- ون بوون (الخفاء) |
| ( ش ) | نى- بلاّوبوون (التّفشي) |

**زانیاری**

سیفەتە پێویستەکان لە هەردوو جۆرەکە: (چ هاودژبن, یان ناهاودژن بن, (صفات لازمة ذوات الأضداد والتي لاضد لها)) بەبەردەوامی لەگەڵ پیتەکان دەخوێندرێنەوە, ئەگەر ساکن بن یان بەسەروژێربن, بەڵام زیاتر بەساکنی لەسەر پیتەکە بەرجەستە دەبن.

## هێزی سیفەتەکان[1]

| ژ | سیفەتە بەهێزەکان | سیفەتە مامناوەندەکان | سیفەتە بێهێزەکان |
|---|---|---|---|
| تر | دەنگبەرزی (الجهر) | قورسکردن (الاصمات) | دەنگنزمی (الهمس) |
| ير | دەنگتوندی (الشّدة) | سووککردن (الاذلاق) | خاوی (الرّخاوة) |
| سم | بەرزبوون (الاستعلاء) | (البينية) مامناوەند لە نێوان (الشّدة والرّخاوة) | نزمبوون (الاستفالة) |
| شم | پێوەلکان (الاطباق) | | کردنەوە (الانفتاح) |
| لھ | لادانی دەنگ (الانحراف) | | نەرمی (اللِّين) |
| | دووبارەکردن (التّكرير) | | |
| | بڵاوبوون (التّفشي) | | |
| تى | درێژخوازی (الاستطالة) | | |
| نى | دەنگتیژی (الصّفير) | | |
| تر بر | هەژان (القلقلة) | | |
| تر تر | مینگە (الغنة)[2] | | |

ئیمامی (السمّنودی) سیفەتە بەهێز و بێهێزەکانی لەم دێڕە شیعرانەدا دیاری کردووە[3]:

ضَعيفُها هَـمْسٌ ورِخْوٌ وخَفا ...... لـينُ انْفِـتاح واستِفالٌ عُـرفا

وما سِـواها وصْـفُه بالقُـوة ...... لا الذَلقِ والإصْماتِ والبَينيةِ

---

(1) حق التلاوة: (صرنىسمسه)

(2) هەندێك لە زانایانی تەجوید, سیفەتی (الغنة) دەخەنە ناو سیفەتە بەهێزەکان, هەندێکیش دەخەنە ناو سیفەتە بێهێزەکان, بەڵام باشتر وایە لە سیفەتە بەهێزەکان هژمار بکرێت، چونکە هەردەم لەگەڵ میم و نوندا دەخوێندرێتەوە و کارێگەرییەکی تەواویشی هەیە لەسەر دروست خوێندنەوەی ئەم دوو پیتە, چونکە دەبێتە هۆی تەواوبوونی پیتەکە.

(3) لآلئ البيان في تجويد القرآن/

## پیتە بەهێزەکان و بێهێزەکان

تۆ- هەر پیتێك، کە گشت سیفەتەکانی بەهێزبن، ئەو پیتە لە گشت پیتەکانی دیکە بەهێزترە، پیتی لە گشت پیتەکان بەهێزتریش، پیتی (ط)ە.

بۆ- هەر پیتێك، کە زۆربەی سیفەتەکانی بەهێزبن، ئەو پیتە بە پیتێکی بەهێز هەژمار دەکرێت، بەڵام هێزەکەی کەمترە لە هێزی پیتی (ط)، وەکوو:

(ص ، ض ، ظ ، ق ، ج ، ب ، ر ، د).

سێ- هەر پیتێك، کە زۆربەی سیفەتەکانی بێهێزبن، ئەو پیتە بە پیتێکی بێهێز هەژمار دەکرێت، وەکوو:

(س ، ك ، ت ، ا ، ل ، ش ، ي ، خ ، ذ ، و ، ع ، ز).

چوار- هەر پیتێك سیفەتە بەهێز و بێهێزەکانی یەکسان بن، ئەو پیتە بە پیتێکی مامناوەند هەژمار دەکرێت، وەکوو: (ن ، ء ، غ ، م ، ل).

پێنج- هەر پیتێك گشت سیفەتەکانی بێهێزبن، ئەو پیتە بە پیتێکی بێهێز هەژمار دەکرێت، واتە هێزەکەی لە هەمووی کەمترە، وەکوو: (ف ، ح ، ث ، هـ).

**تێبینی**

هەشت پیت هەن، ئەگەر لەکاتی وەستان، کەوتنە کۆتایی وشە، پێش ئەوانیش پیتێکی ساکن هەبێت، ئەوا ئەو پیتانە لە خوێندنەوەدا ون دەبن، ئەوانیش بریتین لەمانە: ( ل ، ن ، ي ، ض ، ر ، و ، هـ ، م ) ( لن يضروهم )، بۆیە خوێنەر هەوڵ دەدات ئەم پیتانە دروست بخوێنێتەوە، بەڵام پیتی پێش ئەوان، بە هەڵە دەخوێندرێتەوە، بۆیە پێویستە وریای پیتی پێش ئەوان بین، دەرچە و سیفەتەکانیان بەڕاست و دروستی بخوێندرێنەوە، لە: (قەلقەلە و قەڵەوی و هەمس و...هتد).

وەکوو: ﴿ فَأَهۡلَكَتۡهُ ، ٱلۡفَضۡلُ ، ٱلۡأَرۡض ، قُلِ ٱلۡعَفۡوَ ، مِنَ ٱلۡهَدۡيِ ﴾

خشتەی سیفەتەکان: ڕەنگی (سوور) بۆ سیفەتە بەهێزەکان و ڕەنگی (شین) بۆ سیفەتە بێهێزەکان و ڕەنگی (سەوز)یش بۆ سیفەتە مامناوەندەکان.

| پیت | سیفەتە هاودژەکان | سیفەتی ناهاودژ | سیفەتی بەهێز | سیفەتی مامناوەند | سیفەتە بێهێزەکان | سیفەتی کۆتایی پیتەکە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ء | الشدة ، الجهر، الاستفالة ، الانفتاح ، الاصمات | | ير | تر | ير | پیتی ناوەڕاست (مامناوەند) |
| ب | الشدة ، الجهر، الانفتاح ، الاستفالة ، الاذلاق | القلقلة | □ | تر | ير | پیتێکی بەهێزە |
| ت | الشدة ، الانفتاح ، الاستفالة ، الاصمات الهمس | | تر | تر | □ | پیتێکی بێهێزە |
| ث | الرخاوة ، الهمس ، الاستفالة ، الاصمات ، الانفتاح | | - | تر | □ | پیتی لە هەمووان بێهێزترە |
| ج | الشدة ، الجهر، الانفتاح ، الاستفالة الاصمات | القلقلة | □ | تر | ير | پیتێکی بەهێزە |
| ح | الرخاوة ، الهمس، الاستفالة ، الاصمات ، الانفتاح | | - | تر | □ | پیتی لە هەمووان بێهێزترە |
| خ | الرخاوة ، الهمس، الاستعلاء، الاصمات ، الانفتاح | | تر | تر | □ | پیتێکی بێهێزە |
| د | الشدة ، الجهر، الانفتاح، الاستفالة، الاصمات | القلقلة | □ | تر | ير | پیتێکی بەهێزە |
| ذ | الرخاوة ، الجهر، الاستفالة، الاصمات الانفتاح | | تر | تر | □ | پیتێکی بێهێزە |
| ر | البينية ، الجهر، الاستفالة ، الاذلاق الانفتاح | الانحراف التكرير | □ | ير | ير | پیتێکی بەهێزە |
| ز | الرخاوة ، الجهر، الاستفالة، الاصماتالانفتاح | الصفير | ير | تر | □ | پیتێکی بێهێزە |
| س | الرخاوة ، الهمس، الاستفالة، الاصمات ، الانفتاح | الصفير | تر | تر | □ | پیتێکی بێهێزە |
| ش | الرخاوة ، الهمس، الاستفالة، الاصمات ، الانفتاح | التفشي | تر | تر | □ | پیتێکی بێهێزە |
| ص | الرخاوة ، الهمس، الاستعلاء ، الاصمات، الاطباق | الصفير | □ | تر | ير | پیتێکی بەهێزە |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ض | الرخاوة، الجهر، الاستعلاء، الاصمات ، الاطباق | الاستطالة | □ | تر | تر | پیتێکی بەهێزە |
| ط | الشدة ، الجهر، الاستعلاء، الاصمات ، الاطباق | القلقلة | لھ | تر | -- | پیتی لە هەمووان بەهێزترە |
| ظ | الرخاوة ، الجهر، الاستعلاء، الاصمات ، الاطباق | | □ | تر | تر | پیتێکی بەهێزە |
| ع | البينية ، الجهر، الاستفالة، الاصمات ، الانفتاح | | تر | یر | یر | پیتێکی مامناوەندە |
| غ | الرخاوة ، الجهر، الاستعلاء، الاصمات ، الانفتاح | | یر | تر | یر | پیتێکی مامناوەندە |
| ف | الرخاوة ، الهمس ،الاستفالة، الاذلاق ، الانفتاح | | - | تر | □ | پیتی لە هەمووان بێهێزترە |
| ق | الشدة ، الجهر، الاستعلاء، الاصمات ، الانفتاح | القلقلة | □ | تر | تر | پیتێکی بەهێزە |
| ك | الشدة ، الهمس، الاستفالة، الاصمات ، الانفتاح | | تر | تر | □ | پیتێکی بێهێزە |
| ل | البينية ، الجهر، الاستفالة، الاصمات ، الانفتاح | الانحراف | یر | یر | یر | پیتێکی مامناوەندە |
| م | البينية، الجهر، الاستفالة ، الاذلاق ، الانفتاح | الغنة | یر | یر | یر | پیتێکی مامناوەندە |
| ن | البينية ، الجهر، الاستفالة، الاذلاق ، الانفتاح | الغنة | یر | یر | یر | پیتێکی مامناوەندە |
| هـ | الرخاوة، الهمس، الاستفالة، الاصمات ، الانفتاح | الخفاء | - | تر | لھ | پیتی لە هەمووان بێهێزترە |
| و | الرخاوة ، الجهر، الاستفالة، الاصمات ، الانفتاح | اللين | تر | تر | □ | پیتێکی بێهێزە |
| ي | الرخاوة ، الجهر، الاستفالة، الاصمات ، الانفتاح | اللين | تر | تر | □ | پیتێکی بێهێزە |
| ا مەدی | الجهر، الرخاوة ، الاصمات، الانفتاح | الخفاء | تر | تر | □ | پیتێکی بێهێزە |
| و، ي مەدی | الرخاوة ، الجهر، الاستفالة، الاصمات ، الانفتاح | الخفاء | تر | تر | □ | پیتێکی بێهێزە |

## یر- سیفەتە کاتییەکان (الصّفات العارضة)

سیفەتە کاتییەکان (الصفات العارضة): بریتییە لە ژمارەیەك سیفەتی تەواوکەر, کە هەندێك جار لەگەڵ پیتەکان دەخوێندرێنەوە و هەندێك جاریش لەگەڵ هەمان ئەو پیتانە ناخوێندرێنەوە, ئەوەش لەسەر شوێنی پیتەکە دەوەستێت لە وشەکەدا, هەروەها ئەو پیتانەی کە لە دەوروبەری هەن، وەکوو:

| | | | |
|---|---|---|---|
| 1 | قەڵەوکردن (التفخيم) | 7 | هەڵگەڕانەوە(القلب) |
| 2 | سووككردن (الترقيق) | 8 | تەحریككردن (التحريك) |
| 3 | هەژان (القلقلة) | 9 | ساکنکردن (التسكين) |
| 4 | ئاشکراکردن (الاظهار) | 10 | درێژکردن (المد)[1] |
| 5 | تێکهەڵکێشان(الإدغام) | 11 | وەستانی کورت (السكت) |
| 6 | شاردنەوە(الإخفاء) | | |

ئیمامی (السَّمنودی) سیفەتە کاتییەکانی لەم چەند دێڕە شیعرەدا دیاری کردووە[2]:

إظهارٌ إدغــامٌ وقلبٌ وكَذا ....... إخفَا وَتَفـخيمٌ ورقٌ أُخِـــذا
والمدُ والقَصرُ مَعَ التَّحَرُكِ ....... وأيضًا السُكونُ والسَّكتُ حُكِي

بۆ زانین: ئەم سیفەتانە لە بابەتەکانی ئاییندەدا شی دەکرێنەوە.

---

(□) مەددە(المد) لە سیفەتە پێویستەکانی ئەم سێ پیتەیە ( ا ، و ، ي ), واتە لە بنچینەدا, ئەم سێ پیتە بە دوو جووڵە (حەرەکە) درێژ دەکرێنەوە, بەڵام درێژکردنەوەی پیتی مەددە زیاتر لە ماوە ئاساییيەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، چونکە دۆخێکی دیکەی بەسەر پیتی مەددەکەدا هاتووە, کاتێك کە دەکەوێتە پێش هەمزە یان پاش هەمزە یان پێش پیتێکی ساکن, ئا لەم کاتەدا دەتوانین بە مەددەکە بڵێین سیفەتی کاتی، چونکە بەدرێژی دەخوێندرێتەوە بۆ (شم یان لھ یان □ ) جووڵە (حەرەکە).
- سیفەتی مەددە لەگەڵ پیتەکانی (و ، ی), سیفەتێکی کاتییە، چونکە ئەگەر سەروژێربن (متحرك), نابن بە پیتی مەددە, بەڵام ئەگەر ساکن بن و پێش ئەوانیش (حەرەکە)کەیان لە ڕەگەزی خۆیان بێت, ئەوا بە مەددە دەخوێندرێنەوە.

(یر) لآلئ البيان في تجويد القرآن/□شم-□شم

## خوێندنەوەی پیتە سووك و قەڵەوەكان (الترقيق والتفخيم)

ئ- قەڵەوكردن(التفخيم): قەڵەوكردنی دەنگی پیتەكە، چونكە كۆتایی زمان بەرز دەبێتەوە و ناوەڕاستەكەی قووڵ دەبێتەوە.

ب- سووككردن(الترقيق): سووككردنی دەنگی پیتەكە، چونكە كۆتایی زمانەكە دێتە خوارەوە.

پیتەكانی قورئان لە ڕووی قەڵەوكردن و سووككردنەوەوە دەكرێن بە سێ بەشەوە

| پیتە قەڵەوەكان | ئەو پیتانەی هەندێك جار سووك و هەندێك جاریش قەڵەون | پیتە سووكەكان |
|---|---|---|
| حەوت پیتن, كە پێیان دەڵێن:(حروف الاستعلاء)، ئەوانیش بریتین لەمانە: (خ، ص، ض، غ، ط، ق، ظ) (خص ضغط قظ). | سێ پیتن, ئەوانیش بریتین لەمانە: ( ا، ل، ر)، و مینگە (الغُنّة)ی پیتی نون (ن) | هەموو ئەو پیتانەی كە ماون, بە سووكی دەخوێندرێنەوە, ژمارەیان(نی ئ)پیتن |

زانیاری

قەڵەوكردن و سووككردنی هەندێك پیت كاریگەرییەكی نەرێنی لەسەر گۆڕینی پیتەكە و واتای وشەكە بەجێدێڵێت, وەكوو قەڵەوكردنی پیتەكانی (ت ، س ، د )یان سووككردنی پیتەكانی: (ط ، ص ، ض), وەكوو: (ٱلتَّلَاقِ ، ٱلطَّلَٰقُ ) (مَحْذُورًا ، مَحْظُورًا ) هەندێك جاریش ئەم سیفەتانە واتاكەی ناگۆڕن, بەڵام جوانی پیتەكە دەشێوێنن, وەكوو قەڵەوكردن یان سووككردنی پیتی ئەلیف یان مینگە (الغنە)ی نون, وەكوو: (النَّاسِ، قَالَ) (مِن قَبْلُ ، كُنتُم).

## ﺗ- پیتە بەرزەكان (استعلاء)

### پیتە بەرزەكان (استعلاء)، لە پێنج پلەدا بەقەڵەوی دەخوێندرێنەوە[1]

- بەرزترین پلەی قەڵەوی، ئەگەر ئەلیف لە دوای پیتی بەرز(استعلاء)، هاتبێت، وەكوو:
﴿ غَـاسِقٍ ﴾ ﴿ قَـالَ ﴾ ﴿ وَلَا الضَّالِّين ﴾

ﻳﺮ- پلەی دووەم، ئەگەر پیتی بەرز(استعلاء)، فەتحەی لەسەر بێت و (ئەلیف)یش بە دوایدا نەهاتبێت، وەكوو: ﴿ لَقَدْ ﴾ ﴿ لا ضَيْرَ ﴾ ﴿ خَيْرًا ﴾

ﺳﻢ- پلەی سێیەم، ئەگەر پیتی بەرز(ضمَة)ی لەسەر بێت، وەكوو:
﴿وَقُلِ ٱعْمَلُواْ ﴾ ﴿ طُوبَا لَهُم ﴾ ﴿ بَعْضُهُم ﴾

ﺷﻢ- پلەی چوارەم، ئەگەر پیتی بەرز سكونی لەسەبێت یان بەسكون لەسەری بوەستین، وەكوو:
﴿ ٱلْحَقِّ ﴾ ﴿ رِضْوانَ ﴾ ﴿ ٱهْبِطْ ﴾ ﴿بَعْضٍ﴾

ﻟﻪ- نزمترین پلە، ئەگەر پیتی بەرز، كەسرەی لە ژێر بێت وەكوو:
﴿ قِيلَ ﴾ ﴿ مِنْ غِلٍّ ﴾ ﴿ ظِلالُهُم ﴾

ئیمامی جەزەری دەڵێت[2]:

وحَرفَ الاستعلاءِ فخِّم واخصُصَا ....... لاطبَاقَ أقوَى نَحو قَالَ والعَصَا

---

(١) زانایانی تەجوید، دوو بووچۆنیان هەیە بۆ پلەكانی قەڵەوكردنی پیتەكانی(إستعلاء)، ئەوانیش بریتین لەمانە:

×× بووچۆنی یەكەم سێ پلەن: بەپێی بووچۆنی (أبي الأصبغ عبد العزيز بن علي السُماتيّ تتر□لهھ) كە بە(ابن الطحان) بەناوبانگە و (العلامة الشيخ محمد بن أحمد المتولي تسمترسمترھ)، بەم سێ پلەی خوارەوە:

ﺗﺮ- ئەگەر فەتحەی لەسەر بێت، وەكوو: (لَقَد ، قَالَ)    ﻳﺮ- ئەگەر (ضمَة)ی لەسەر بێت، وەكوو: (طُوبَا)

ﺳﻢ-ئەگەر كەسرەی لە ژێر بێت، وەكوو(مِنْ غِلٍّ)

بەپێی ئەم بووچۆنە، پیتی ساكن، بەپێی حەرەكەی پیتی پێش خۆی قەڵەو دەكرێت و بەقەڵەوی دەخوێندرێتەوە.

×× بووچۆنی دووەم پێنج پلەن: لەم كتێبەدا ئەم بووچۆنەمان وەرگرتووە، كە بووچۆنی ئیمامی جەزەری (تسمستيھ)یە سەیری كتێبەكانی: (المنح الفكرية: (صرپي لهتر-بر□تر)؛ جُهد المُقِل: (ص لهلهتر) ؛ (هداية القارئ ص لهبرتر-□برتر) بكە.

(ﻳﺮ) المقدمه الجزريه/ لهشم

## ب- ئەو پیتانەی کە بەسووکی و قەڵەوی دەخویندرێنەوە

### أ- خوێندنەوەی پیتی ( لام ), بە سووکی و قەڵەوی

پیتی لام (ل) لەو پیتانەیە, کە بەبەردەوامی بەسووکی دەخوێندرێنەوە, جگە لەو لامەی کە لەگەڵ ناوی پەروەردگار (ٱللَّهِ)دێت, بە دوو شێواز دەخوێندرێتەوە:

أ- قەڵەوکردن: ئەگەر پێش وشەی (ٱللَّه), فەتحە بێت یان (ضمَة) بێت، لەو حاڵەتەدا ئەو لامەی لەگەڵ وشەی (ٱللَّه)هاتووە, بەقەڵەوی دەخوێندرێتەوە، وەکوو:

﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ ﴿ رُسُلُ ٱللَّهِ ﴾ ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾ ﴿ سَيُؤۡتِينَا ٱللَّهُ ﴾

ئیمامی (الجزري) دەڵێت[1]:

وفَخِّمِ اللَّامَ من اسمِ اللهِ ...... عَن فَتحٍ أوضَمٍ كَعَبدُاللهِ

ب – سووککردن: ئەگەر پێش وشەی (ٱللَّه) کەسرە بێت (رەسەن بێت یان نارەسەن بێت), لەو حاڵەتەدا ئەو لامەی لەگەڵ وشەی (ٱللَّه)یە, بەسووکی دەخوێندرێتەوە، وەکوو:

﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ﴾ ﴿ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ ﴾ ﴿ مَن يُحَادِدِ ٱللَّهَ ﴾ ﴿ وَيُنَجِّي ٱللَّهُ ﴾
﴿ قَوۡمًا ٱللَّهُ مُهۡلِكُهُمۡ ﴾ ﴿ أَحَدٌ ١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴾




وێنەی زمان بۆ خوێندنەوەی لامی سووک و قەڵەو

---

## ب- خوێندنەوەی پیتی (ألف) بەسووكی یان بەقەڵەوی

پیتی ئەلیف ( ا ) پیتێكە, نە قەڵەوە و نە سووكیشە, بەڵام بەپێی پیتی پێش خۆی, بەم دوو شێوازە دەخوێندرێتەوە:

**قەڵەوكردن**

ئەگەر پێش ئەلیف, یەكێك لە پیتە بەرزەكان هاتبێت:(خ، ص، ض، غ، ط، ق، ظ) یان(ل،ر)ی قەڵەو هاتبن وەكوو: ﴿ٱللَّهِ﴾﴿قَالَ﴾﴿تَخَاصُمُ﴾﴿مَرَضًا﴾﴿رَاضِيَةً﴾

**سووككردن**

ئەگەر پێش ئەلیف, پیتێكی(سووك) هاتبێت، وەكوو: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ﴾ (1)







---

(1) الحجرات:سمتر

## سم- قەڵەوكردن و سووككردنی مینگە (الغنە)ی (ن)

خوێندنەوەی غوننەی (ن)ی قەڵەو یان سووك لەسەر ئەو پیتەی كە دوای ئەو دەمێنێتەوە

| قەڵەوكردن | سووككردن |
| --- | --- |
| ئەگەر یەكێك لەم پێنج پیتە قەڵەوانە لە دوای نون, یان تەنوینەوە هاتبێت: (ص، ض، ط، ق،ظ) ، وەكوو: ﴿فَإِذَا فَرَغۡتَ فَٱنصَبۡ﴾ ﴿مِن طَيِّبَٰتِ﴾ ﴿مِن قَبۡلِهِۦ﴾ ﴿ظِلّٗا ظَلِيلًا﴾ ﴿وَمَن ضَلَّ﴾ | ئەگەر گشت پیتەكان لە دوای نونی ساكن یان تەنویندا هاتبن، وەكوو: ﴿كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ ﴿إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرٞ﴾ ﴿مُسَخَّرَٰتُۢ بِأَمۡرِهِۦٓ﴾ ﴿مِن وَلِيّٖ﴾ |

لەم دێڕە شیعرەدا, (الإمام السّمنودی) دەری خستووە, ئاخۆ كەی ئەلیف و غوننەی نون, بەقەڵەوی یان بەسووكی دەخوێندرێنەوە:

والرَّومُ كالوَصلِ وتَتّبِعِ الأَلِفْ ....... ماقبلَهَا وَالعَكسُ في الغُنّ أُلِفْ [1]

**واتە:**

- قەڵەوكردن و سووككردنی پیتی ئەلیف, پەیوەستە بەو پیتەوە كەدەكەوێتە پێش خۆی.
- قەڵەوكردن و سووككردنی غوننەی نون, پەیوەستە بەو پیتەوە كەدەكەوێتە دوای خۆی.

---

(1) لآلئ البيان في تجويد القرآن /بيت

## شم- قەڵەوکردن و سووککردنی پیتی ( راء)

تر- لە (شەش) حاڵەتدا پیتی ( راء) بەقەڵەوی دەخوێندرێتەوە.
یر- لە (شەش) حاڵەتدا پیتی ( راء) بەسووکی دەخوێندرێتەوە.
سم- لە (دوو) حاڵەتیشدا دروستە کە پیتی ( راء) بەسووکی یان بەقەڵەوی بخوێندرێتەوە.

بۆ زانین: مەرجی سووککردن و قەڵەوکردنی پیتی (راء) بە وشەیەکەوە بەستراوەتەوە.

### ١- لەو حاڵەتانەی کە پیتی ( راء) بەقەڵەوی دەخوێندرێتەوە

تر- ئەگەر پیتی ( راء) فەتحە یان (ضمَة)ی لەسەر بێت، وەکوو:

﴿ ٱلرَّحۡمَٰنِ ﴾ ﴿رَمَضَانَ﴾ ﴿ وَهِيَ رَمِيمٞ ﴾ ﴿كَفَرُوا﴾ ﴿ ٱلرُّسُلَ﴾ ﴿ رُءُوسَهُمۡ ﴾

یر- ئەگەر پیتی ( راء) سکونی لەسەر بێت و پێش ئەو فەتحە یان (ضمَة) بێت، وەکوو:

﴿مَرۡيَمَ﴾ ﴿ ٱلۡأَرۡضِ ﴾ ﴿ ٱلۡقُرۡءَانِ ﴾ ﴿ أُرۡسِلُواْ ﴾

سم- کاتێك بە سکون, لەسەر پیتی ( راء) دەوەستین, هەروەها پیتی پێش ئەویش سکونی لەسەر بێت و ئەو پیتەی پێش ئەوانیش فەتحە یان (ضمَة)ە بێت, وەکوو:

﴿ لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ ﴾ ﴿وَٱلۡفَجۡرِ﴾ ﴿ وَٱلۡعَصۡرِ ١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ﴾ ﴿كَٱلۡقَصۡرِ ﴾

شم- ئەگەر پێش پیتی(راء)ی ساکن کەسرە بێت و دوای ئەویش پیتێکی بەرز(إستعلاء)ی هاتبێت, بەڵام کەسرەی لە ژێر نەبێت وەکوو:

﴿مِرۡصَادٗا﴾ ﴿قِرۡطَاسٖ ﴾ ﴿فِرۡقَةٖ﴾

له- ئەگەر پێش پیتی( راء)ی ساکن کەسرەیەکی نارەسەن بێت (هەمزەی گەیاندنی هاتبێت) لەکاتی دەستپێکردن, وەکوو:

﴿ٱرۡتَابُوٓاْ﴾ ﴿ٱرۡجِعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيكُمۡ﴾ ﴿ ٱرۡحَمۡهُمَا ﴾

- ئەگەر پیتی( راء) ساکن بێت و پێش ئەویش کەسرە بێت (چ ڕەسەن بێت, یان کاتی بێت) لە وشەی پێشتردا (کاتی بەیەکگەیاندن) وەکوو:

﴿رَبِّ ٱرۡجِعُونِ﴾ ﴿ ٱلَّذِي ٱرۡتَضَىٰ ﴾ ﴿ لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ ﴾ ﴿ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ ﴾

## ب- لەو حاڵەتانەی پیتی ( ر ) تێیدا بەسووكی دەخوێندرێتەوە

ت- ئەگەر پیتی(راء)كەسرەی لە ژێر بێت، وەكوو: ﴿كَرِيمٍ﴾ ﴿بِرِيحٍ﴾ ﴿مُرِيبٍ﴾ ﴿يُفَرِّقُونَ﴾

ب- ئەگەر پیتی(راء) ساكن بێت(سكونی ڕەسەن)و پێش ئەویش كەسرە بێت و دوای ئەویش هیچ پیتێكی بەرز(استعلاء) نەهاتبێت، وەكوو: ﴿فِرۡعَوۡنُ﴾ ﴿فِي مِرۡيَةٍ﴾ ﴿ نُعَمِّرۡكُم﴾

س- كاتێك بە سكون لەسەر پیتی (راء) دەوەستین و پێش ئەویش كەسرە بێت, وەكوو:
﴿ مُّدَّكِرٍ ﴾ ﴿ وَٱزۡدُجِرَ ﴾ ﴿يَوۡمٌ عَسِرٌ ﴾ ﴿ كَأَنَّهُمۡ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ ﴾

ش- كاتێك بە سكون, لەسەر پیتی ( راء) دەوەستین, و پیتی پێش (راء)یش سكونی لەسەر بێت یان (یاء) بێت و پیتی پێش ئەوانیش كەسرەی لە ژێر بێت، وەكوو:
﴿ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ﴾﴿ لِّذِي حِجۡرٍ ﴾ ﴿وَٱللَّهُ قَدِيرٌ ﴾ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ ﴾

ل- كاتێك بە سكون, لەسەر پیتی ( راء) دەوەستین, و پێش ئەویش یائی (ي) نەرم [1] بێت، وەكوو: ﴿لَا ضَيۡرَ ﴾ ﴿وَقَدَّرۡنَا فِيهَا ٱلسَّيۡرَ﴾ ﴿ خَيۡرَ ﴾

- ئەگەر دوای پیتی(راء),ئەلیفی لاركردنەوە هاتبێت، وەكوو: ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٜىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآ﴾







**زانیاری**

پیتی (راء) لە بنچینەدا بەقەڵەوی دەخوێندرێتەوە, هەروەك پیتەكانی (استعلاء), بەڵام لە پیتە (استعلاء)ەكان نییە, چونكە هەندێك جار بەسووكی دەخوێندرێتەوە. [2]

---

(1) یائی نەرم (لین), پیتێكی ساكنە و پێش ئەویش فەتحەیە, بەڵام یائی مەددە, پیتێكی ساكنە و پێش ئەویش كەسرەیە.

(2) حق التلاوە:(صرێی لهیر)

## سم- حاڵەتەكانی سووكردن یان قەڵەوكردنی پیتی ( راء)

لەم دوو حاڵەتەدا, دروستە ئەگەر پیتی (راء) بەسووكی یان بەقەڵەوەی بخوێندرێتەوە:

تر- لە كاتی بەیەكگەیاندن: ئەگەر پێش (رائی) ساكن كەسرە بێت و دوای ئەویش پیتێكی بەرز (إستعلاء) بێت و كەسرەی لە ژێر بێت، تەنیا وشەی ﴿فِرۡقٍ﴾ لە قورئاندا بەم شێوەیە هاتووە[1] لەم ئایەتەدا: ﴿فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ٦٣﴾ (الشعراء)

ئیمامی جەزەری دەڵێت[2]:

والخُلفُ في فِرقٍ لكسرٍ يُوجدُ ...... وأخفِ تَكريرًا إذا تُشدَدُ

> **زانیاری**
>
> ئەگەر لەسەر وشەی ﴿فِرۡقٍ﴾ نەوەستاین, باشتر وایە (راء)ەكە بەسووكی بخوێنینەوە, بەهۆی ئەو كەسرەی لە ژێر قاف هەیە، بەڵام كاتێك بە سكون لەسەری دەوەستین, پیتی (راء) بەقەڵەوی دەخوێنینەوە، چونكی قاف قەڵەوتر دەبێتەوە، هەروەها كاتێك بە رەوم لەسەر﴿فِرۡقٍ﴾دەوەستین, دروستە پیتی (راء) بەسووكی و بەقەڵەوی بخوێندرێتەوە.

یر- كاتی وەستان: كاتێك بە سكون, لەسەر پیتی ( راء) دەوەستین و پێش پیتی (راء) پیتێكی ئیستعلای ساكن بێت و پێش ئەویش كەسرە بێت، وەكوو وشەی ﴿مِصۡرَ﴾ لە سورەتەكانی (یونس), (یوسف) و (الزخرف)دا و وشەی ﴿ٱلۡقِطۡرِ﴾ لە سورەتی (سبأ)دا.

> **زانیاری**
>
> تر- كاتێك لەسەر وشەی﴿مِصۡرَ﴾ دەوەستین, باشتر وایە ڕائەكە بەقەڵەوی بخوێنینەوە، چونكە لە كاتی بەیەكگەیاندن بەقەڵەوی دەخوێندرێتەوە،
>
> یر- كاتێك بە سكون لەسەر وشەی ﴿ٱلۡقِطۡرِ﴾ دەوەستین, باشتر وایە ڕائەكە بەسووكی بخوێنینەوە، چونكە لە كاتی بەیەكگەیاندن, بەسووكی دەخوێندرێتەوە[3].

(تر) جهد المقلّ :(ص بيتر-بييير) (یر) المقدمة الجزرية/نيتر

(سم) هداية القارئ: (جتر صيرسمترشمسمتر)؛ نهاية القول المفيد:(صرتيني- نيني)، غاية المريد: (صرسمترشمتر- لهتر)

×× ئەم چوار وشە: (وَنُذُرِ, يَسۡرِ, أَسۡرِ, فَأَسۡرِ), زانایان دوو بووچۆنیان هەیە بۆ قەڵەوكردن و سووككردنی پیتێ (راء):

تر- لەكاتی وەستان, پیتی(راء) لەم وشانەدا بەقەڵەوی دەخوێندرێتەوە، چونكە ساكنە و پێش ئەویش فەتحە یان (ضمة)یە.

یر- پیتی ( راء) لەم وشانەدا بەسووكی دەخوێندرێتەوە، چونكە ئەم وشانە لە بنچینەدا بەم شێوەیەن: (وَنُذُرِي ، يَسۡرِي، أَسۡرِي, فَأَسۡرِي), پیتی(راء) كەسرەی لە ژێرە ویائەكەش سڕاوەتەوە لەبەر سووككرن یانیش لەبەر(بناء)ی وشەكە بەڵام پێویستە بەم شێوەیە زۆر وشە بگەڕێنینەوە سەر ئەسڵی خۆیان, ئینجا سووك یان قەڵەویان كەین, وەك: (وَٱلۡعَصۡرِ, وَٱلۡفَجۡرِ, ٱلۡجَوَارِ) و ئەمەش ناڕاستە, بۆیە تەنیا بەپێی ئەو وێنانە دەخوێنینەوە كە نووسراون, واتە قەڵەوكردن لە هەرسێ وشەكەدا.

## ﴿ هەژان (القلقلة) ﴾

(القلقلة) لە ڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە هەژان[1].

لە ڕووی زاراوە (اصطلاحًا)وە: بریتییە لە هەژانی پیتە زەنندەدار (ساكن)ەكە, لە دەرچەكەیدا, واتە دەرچەی پیتەكە دەكەینەوە, دوای داخستنی بە هۆی سكونەوە, تا پیتی هەژان (قەلقەلە) لەوێوە بێتە دەرەوە, بەبێ ئەوەی دەنگی هیچ جووڵە (حەرەكە)یەك لەگەڵی بێتە دەرەوە.

پیتەكانی بریتین لە :(ق ، ط ، ب ، ج ، د ) لەم ڕستەیەدا كۆكراونەتەوە: (قطب جد).

### پلەكانی هەژان (مراتب القلقلة)[2]

- **قەلقەلەی بچووك**
  - ئەگەر پیتی قەلقەلەی ساكن لە ناوەندی وشەكە بێت، وەكوو: ﴿لَآ أُقۡسِمُ﴾ ﴿تَـجۡرِي﴾ ﴿يُبۡدِئُ﴾
  - ئەگەر پیتی قەلقەلەی ساكن لە كۆتایی وشەكە بێت و لەسەری نەوەستین، وەكوو: ﴿لِيُنفِقۡ ذُو سَعَةٍ﴾ ﴿وَقَدۡ أَحۡسَنَ﴾
- **قەلقەلی گەورە**
  - كاتێك لەسەر پیتی قەلقەلە دەوەستین، وەكوو: ﴿أَحَدٌ﴾ ﴿ٱلۡفَلَقِ﴾ ﴿لُوطٍ﴾
  - كاتێك لەسەر پیتی قەلقەلەی بەشەددە دەوەستین، وەكوو: ﴿وَتَبَّ﴾ ﴿ٱلۡحَقُّ﴾ ﴿ٱلۡحَجِّ﴾

ئیمامی جەزەری دەڵێت[3]:

وَبَيِّنَنْ مُقلقَلًا إنْ سَكَنا...... وَإنْ يَكُنْ في الوَقفِ كَانَ أَبْيَنا

---

(1) مختار الصحاح: مادة قلي: (ص[illegible])

(2) دوو پلە: مكي بن أبي طالب لە كتێبی (الرعاية)دا و أبو عمرو الداني لە كتێبی (التحديد) دا و ابن الجزري د (المقدمة ، النشر)دا ؛ هداية المستفيد:(ص[illegible]) ؛ التجويد المصور:(ص[illegible])

(3) المقدمة الجزرية/ [illegible]

## ئەو هەڵانەی لە قەلقەلەدا دەکرێن:

ت- خوێندنەوەی هەمزە لە کۆتایی وشە, وەکوو: ( أَحَدْء ، ٱلْفَلَقْء )
ب- خوێندنەوەی جوولە (حەرەکە)یەك لەگەڵ پیتی قەلقەلە, وەکوو: ( وَقَدْ أَحْسَنَ ، لَآأُقْسِمُ)
سم- پچڕانی دەنگی پیتەکە, وەکوو: ( لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ ، يُبْدِئُ )
شم- درێژکردنەوەی دەنگ, دواى قەلقەلە, وەکوو: ( أَحَدْ – ، ٱلْفَلَقْ – )

**تێبینی**

هەندێك خوێنەر هەن, هەموو پیتە ساکنەکان دەکەن بە قەلقەلە, ئەمەش کارێکی نادروستە، بۆیە دەتوانن خۆیان لەم هەڵەیە ڕزگار بکەن, بە خوێندنەوەی سیفەتەکانی پیتی ساکن لە (همس، رِخاوة، شدة، بينية، استطالة،....), بەو مەرجەی پیتەکە ڕەها نەکرێت, تا ئامادەسازی بۆ پیتی دواى ئەو نەکرێت، وەکوو: ( إِنَّكُمْ وَ مَا تَعْبُدُونَ ، ٱلْمُؤْمِنِينَ ، أَرْسَلْنَا ، ٱضْرِب , وَإِذْ يَرْفَعُ )

هەندێك لە زانایانی تەجوید, پلەکانی خوێندنەوەی قەلقەلە دەکەن بە سێ پلە(1) , بەم شێوەیەی خوارەوە:

ت- قەلقەلەی گەورە: وەستان لەسەر پیتی قەلقەلە لە کۆتایی وشە و شەددەی لەسەر بێت، وەکوو: ﴿وَتَبَّ﴾ ﴿ٱلْحَآجِّ﴾
ب- قەلقەلەی مامناوەند: وەستان لەسەر پیتی قەلقەلە لە کۆتایی وشە و بێ شەددە بێت، وەکوو: ﴿ أَحَدٌ﴾ ﴿ٱلْفَلَقِ﴾
سم- قەلقەلەی بچووك: کاتی بەیەکگەیاندن, هەروەها ئەگەر پیتی قەلقەلە لە ناوەندی وشەکە یان لە کۆتایی وشەکە بێت، وەکوو: ﴿مَطْلَعِ﴾ ﴿وَقَدْ أَحْسَنَ﴾

**بوزانین:** باشتر وایە بۆ پلەکانی (قەلقەلە), دوو پلەکە پەیڕەو بکەین، چونکە پیتی کۆتایی چ بەشەددە بێت یان بێ شەددە بێت, دەبن بە یەك پلە، چونکە قەلقەلە لە پیتی دووەمدایە لە پیتە گیرەدارەکان (مشدد).

---

(ت) سێ پلە: (المنح الفكريه: (صرشمشمت)؛ المنير:(ص تى نى))

# بەشی چوارەم

- بەدوای یەكدا هاتنی پیتەكان ( إلتقاء الحروف )
  - الاظهار
  - الادغام
    - إدغام المتماثلين
    - إدغام المتقاربين
    - إدغام المتجانسين
- ير- یاساكانی نونی ساكن و تەنوین ( أحكام النون الساكنة والتنوين )
- یاساكانی میمی ساكن ( أحكام الميم الساكنة )
- شه- پلەكانی مینگە ( مراتب الغُنة )
- یاساكانی لامی ساكن ( أحكام اللام الساكنة )
  - لامی شەمسی ( اللام الشمسية )
  - لامی قەمەری ( اللام القمرية )
- ئیدغامی گەورە و بچووك ( الادغام الكبير والصغير )
- گەیەشتنی دوو پیتی زەننەدار ( إلتقاء الساكنين )
- تى- یائە زیادكراوەكان و یائە زیادەكان ( ياءات الاضافة وياءات الزوائد )

## بەدوای یەکدا هاتنی پیتەکان (إلتقاء الحروف)

لە نووسینی وشە و ئایەتەکاندا زۆر جۆرە پیت دەکەونە دوای یەك، جا چ ساکن بن یاخود بەسەروژێربن (متحرك) [1], ئەم پیتانە بە چوار شێواز بەدوای یەکدا هاتوون:

یەکەم -هاوشێوەن (متماثلین), وەکوو: (ك) لەگەڵ (ك) , (ن) لەگەڵ (ن)
دووەم -لێك نزیکن (متقاربین), وەکوو: (ن) لەگەڵ ( ل) , (ل) لەگەڵ (ر)
سێیەم -هاوڕەگەزن (متجانسین), وەکوو: (ت) لەگەڵ (ط) , (ذ) لەگەڵ (ظ)
چوارەم -لە یەکەوە دوورن (متباعدین) وەکوو: (ن) لەگەڵ (ع) , (ب) لەگەڵ (ك)

هەرکاتێك ئەم پیتانە بە دوای یەکدا هاتن، بە هەندێك یاسا دەخوێندرێنەوە, وەکوو :
( یەکەم- الادغام, دووەم- الاظهار, سێیەم- الاخفاء, چوارەم- القلب, پێنجەم- التحریك, شەشەم- الابدال, حەوتەم- الحذف)
هەر یەك لەم یاسایانە لەکاتی خۆیدا شرۆڤە دەکرێت.

یەکەم -ئاشکراکردن (الاظهار), لەڕووی زمانەوانییەوە: دەرخستن و بەیانکردن.
لەڕووی زاراوە (اصطلاحا)ەوە: خوێندنەوەی هەر پیتێك لە دەرچەکەی خۆیدا لەگەڵ خوێندنەوەی سیفەتەکانی هەر پیتێك لەگەڵیدا، کە تێکەڵ بە پیتی دواتر نەبیت و غونەی درێژیش لەگەڵ پیتەکانی (ن , م) ناخوێندرێتەوە.

لە ڕوایەتی ئیمام (حفص)دا, پیتەکان لەم حاڵەتانەدا بە (إظهار) دەخوێندرێنەوە:

یەکەم- ئەگەر دوو پیت بەدوای یەکتریدا هاتبن و پیتی دووەم ساکن بێت یا خود هەردوو پیتەکە(متحرك)بن, ئەوا هەر پیتێك بە جیا و بەئاشکرا (اظهار) دەخوێندرێتەوە, وەکوو:

﴿ شَقَقۡنَا ﴾ ﴿ تَتۡرَا ﴾ ﴿ حَبِطَتۡ ﴾ ﴿ بِشِرۡكِكُمۡ ﴾

دووەم- ئەگەر پیتە لێکدوورەکان (الحرفین المتباعدین), بەدوای یەکتریدا هاتبن, ئەوا بە (إظهار) دەخوێندرێنەوە, جا چ ساکن, یان(متحرك)بن, چونکە دەرچەکانیان لە یەکتری دوورن, تەنانەت ئەگەر سیفەتەکانیشیان وەکوو یەکبن یاخوت جیاوازبن, وەکوو:

﴿ مَنۡ ءَامَنَ ﴾ ﴿ يَلۡتَقِطۡهُ ﴾ ﴿ أَلَمۡ يَعۡلَم ﴾ ﴿ وَٱكۡتُبۡ لَنَا ﴾

(1) گشت پیتەکان بەدوای یەکدا دەنووسرێن، جگە لە دوو ئەلیف، هیچ کاتێك بەدوای یەکدا نانووسرێن، چونکە ئەلیف هەموو کاتێك ساکنە و پێویستە پێش خۆی پیتێکی بە فەتحە هەبێت.

يـ- تێكهەڵكێشان (الإدغام), لەڕووی زمانەوانییەوە: تێخستن (خستنە ناوی).
لەڕووی زاراوە (اصطلاحا)ەوە: داخلكردنی پیتی یەكەم بۆ ناو ئەو پیتەی بەدوایدا دێت، لەو حاڵەتەدا هەردوو پیتەكە بە پیتێكی گران (مشدد) لە ڕەگەزی پیتی دووەم دەخوێندرێنەوە و دەنووسرێن[1]. كە دەرچە بۆ هەردووكیان یەك جار بەریەك دەكەوێت.

لە ڕوایەتی ئیمام (حفص)دا مەرجی ئیدغام پێویستە پیتی یەكەم ساكن بێت وپیتی دوومیش بە سەرو ژێر (متحرك)بێت.
ئەگەرەكانی ئیدغام سیانن، كە دەبنە سێ جۆری ئیدغام, بەم شێوەیە:

**جۆرەكانی ئیدغام (انواع الإدغام)**

- أ- ئیدغامی هاوشێوە (إدغام المتماثلین)
- ب- ئیدغامی لێكنزیك (إدغام المتقاربین)
- ج- ئیدغامی هاوڕەگەز (إدغام المتجانسین)

أ- تێكهەڵكێشانی دوو پیتی هاوشێوە (إدغام الحرفین المتماثلین):

ئەگەر دوو پیتی هاوشێوە بە دوای یەكدا هاتبن و پیتی یەكەم ساكن بێت و پیتی دووەمیش(متحرك)بێت, پیتە ساكنەكە تێكهەڵكێشی ئەو پیتە دەكەین, كە بەدوایدا هاتووە (ادغام كامل), جا چ لە وشەیەكدا بێت, یاخود لە دوو وشەدا بێت، وەكوو:

﴿أَيْنَمَا تَكُونُواْ يُدْرِككُّمُ ٱلْمَوْتُ﴾ بە ﴿يُدْرِكُّمُ ٱلْمَوْتُ﴾ دەخوێندرێتەوە
﴿وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبُۢ بِٱلْعَدْلِ﴾ بە ﴿وَلْيَكْتُبَّيْنَكُمْ كَاتِبُ﴾ دەخوێندرێتەوە
﴿كَلَّاۖ بَل لَّا تُكْرِمُونَ ٱلْيَتِيمَ﴾ بە ﴿كَلَّا بَلَّا تُكْرِمُونَ ٱلْيَتِيمَ﴾ دەخوێندرێتەوە
﴿كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوْاْ فِيهِ﴾ بە ﴿لَهُمَّشَوْاْ فِيهِ﴾ دەخوێندرێتەوە

(1) أحكام قراءة القرآن:(ص له[illegible]تر-[illegible]تر)

زانیاری

ئ- هەردوو پیتە مەددەكە ( و ، ي ), كە هەمیشە ساكنن, ئەگەر بكەونە پێش پیتەكانی (و، ی)ی (متحرك), ئیدغام ناكرێن، چونكە یەك دەرچەیان نییە,

وەكوو: ﴿ فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ ﴾ ﴿ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ﴾

ب- لە كاتی بە دوایەكداهاتنی دوو (واو)دا, بەڵام (واو)ی یەكەم پیتی نەرم (حرف اللین) بێت (پیتێكی ساكنە و پێش ئەویش فەتحەیە), لەگەڵ ئەو (واو)ەی كە بەدوایدا دێت ئیدغام دەبێت, وەكوو:

﴿ ٱتَّقَوا۟ وَّءَامَنُوا۟ ﴾ بە ﴿ ٱتَّقَوَّءَامَنُوا۟ ﴾ دەخوێندرێتەوە
﴿ عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ ﴾ بە ﴿ عَصَوَّكَانُوا۟ ﴾ دەخوێندرێتەوە

ب- تێكهەڵكێشانی دوو پیتی لێكنزیك (إدغام الحرفين المتقاربين):

ئەگەر دوو پیت بە دەرچە و سیفەت یان بە دەرچە یاخود تەنیا بە سیفەت لێكنزیكبن[1] و بەدوای یەكتریشدا هاتبن و پیتی یەكەم ساكن بێت و پیتی دووەمیش بە سەروژێربێت (متحرك), ئەوا پیتی یەكەم تێكهەڵكێشی پیتی دووەم دەكەین, پیتی دووەمیش بەشەددە دەنووسرێت, ئەگەر ئیدغامی تەواو بێت، بەڵام ئەگەر ئیدغامی ناتەواو بێت, ئەوا پیتی دووەم بەبێ شەددە دەنووسرێت.

## (إدغام المتقاربين) لەگەڵ ئەم پیتانە دروست دەبێت:

ئ- پیتی (لام)ی ساكن لەگەڵ پیتی(راء)
ب- پیتی (لام)ی پێناسین, لەگەڵ پیتە شەمسییەكان
س- پیتی(نون) یاخود تەنوین لەگەڵ پیتەكانی (یرملو)
ش- پیتی (قاف) لەگەڵ پیتی (كاف)

---

( ئ) هدایە القاری:(ئ/ ص٢٢٢)؛ حق التلاوە:(ص ٣٤٣)

**(إدغام المتقاربين)** بە دوو شێوە دروست دەبێت

**أ- ئیدغامی تەواو,** لەگەڵ ئەم پیتانە دروست دەبێت:

تر- (ل) لەگەڵ (ر) [1] وەکوو: (قُل رَّبِّي)

یر-(ل)ی پێناسین لەگەڵ پیتە شەمسییەکان, وەکوو:

(ٱلنَّهَارَ) (ٱلتَّوَابُ) (ٱلشَّمۡسُ).

سم- (ن) یاخود تەنوین, لە گەڵ یەکێك لەم سێ پیتانە: ( ر ، م ، ل ) [2] وەکوو: (مِّن رَّبِّكَ ) (مِن مَّارِجٖ) (مِن لَّدُنۡهُ) (تَوَّابٗا رَّحِيمًا) (فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ) (إِصۡلَاحٞ لَّهُمۡ)

شم- (ق) لەگەڵ (ك) وەکوو: ( أَلَمۡ نَخۡلُقكُّم ) [3]

**ب- ئیدغامی ناتەواو**

**(إدغام ناقص)**

لەگەڵ ئەم پیتانە دروست دەبێت: (ن) یان تەنوین لەگەڵ پیتەکانی(و، ی)یە, وەکوو:

(مَن يَخۡشَىٰهَا) (مِن وَلِيّٖ)

**چۆنیەتی خوێندنەوەی (إدغام المتقاربين)**

﴿ قُل رَّبِّي ﴾ بە ﴿ قُرَّبِي ﴾ دەخوێندرێتەوە

﴿ أَلَمۡ نَخۡلُقكُّم ﴾ بە ﴿ نَخۡلُكُّم ﴾ دەخوێندرێتەوە

﴿ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾ بە ﴿ أَثَّمَرَاتِ ﴾ دەخوێندرێتەوە

﴿ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِ ﴾ بە ﴿ بَرَّفَعَهُ اللَّهُ ﴾ دەخوێندرێتەوە

﴿وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ﴾ بە ﴿ومَلَّمۡ يَتُبۡ﴾ دەخوێندرێتەوە

﴿وَمَن يَكُنِ﴾ بە ﴿ وَمَيَّكُنِ﴾ دەخوێندرێتەوە

---

(تر) (یر) بەپێی بووچۆنی ئەم زانایانە (الفرَّاء, المبرِّد و الجرمي) ئیدغامی ئەم پیتان (ن، ل، ر) لەگەڵ یەکتریدا, لە ئیدغامی هاوڕەگەزەکانە (إدغام المتجانسين), چونکە ئەم زانایانە دەڵێن (ن، ل، ر) لە یەك دەرچە دەردەچن, بەڵام لەلایەن زانایان (سيبويه, الشاطبي و الامام الجزري) ئیدغامی ئەم پیتان (ل, ر, ن) لەگەڵ یەکتریدا, لە (ادغام المتقاربين)ە, چونکە لەلایی ئەم زانایانە دەرچەی ئەم پیتانە لەیەکەوە نزیکن.

(سم) ئەم وشەیە بە ریوایەتی(حفص) بەرێگای(الشاطبية والتيسير والطيبة) تەنیا بە ئیدغامی تەواو دەخوێندرێتەوە, بەڵام ئیمامی جەزەری ئاماژە پێداوە کەبە ئیدغامی ناتەواویش دەخوێندرێتەوە, وەك دەڵێت (والخلف بنخلقكم وقع) ئەویش بەرێگای (مكي ابن أبي طالب(تبیسشمهـ) و أبي بكر بن مهران), واتە سیفەتی ئیستعلائی پیتی (قاف) ناچێتە ناو پیتی(کاف)ەوە, تەنیا دەرچە ئیدغام دەبێت, بۆیە پێی دەڵێن (ئیدغامی ناتەواو)

## ج- تێکهەڵکێشکردنی دوو پیتی هاوڕەگەز (إدغام الحرفين المتجانسين):

ئەگەر دوو پیت یەك دەرچەیان هەبێت و بەدوای یەکتریدا هاتبن, بەلاَم لە هەندێك سیفەتدا لێکجیابن و پیتی یەکەم ساکن بێت و پیتی دووەمیش (متحرك)بێت, ئەوا پیتی یەکەم لەگەلّ پیتی دووەم تێکهەڵکێش دەکەین, ئەم ئیدغامەش, لە نێوان وشەیەك و دوو وشەشدا پەیدا دەبێت.

(إدغام المتجانسين), لە ڕیوایەتی (حفص)دا بەتەنیا لەگەلّ ئەم پیتانە[1] دەبێت:

1- ( ط ، د ، ت ) (الحروف النّطعية) وەكوو: ﴿ أَثۡقَلَت دَّعَوَا , أَحَطتُ , قَدتَّبَيَّن ﴾

2- ( ظ ، ذ ، ث ) (الحروف اللّثوية) وەكوو: ﴿ إِذ ظَّلَمُوٓاْ , يَلۡهَث ذَّٰلِكَ ﴾

3- ( ب ، م ) (الحروف الشّفوية) وەكوو: ﴿ ٱرۡكَب مَّعَنَا ﴾

**إدغام المتجانسين**

- ١- ئیدغامی تەواو (إدغام كامل)
- ٢- ئیدغامی ناتەواو (إدغام ناقص)

### أ- ئیدغامی تەواو (إدغام كامل):

پیتی یەکەم بە دەرچە و سیفەتەوە دەچێتە ناو ئەو پیتەی بە دوایدا هاتووە, واتە لە خوێندنەوەدا, یەکسەر دەچینە دەرچەی پیتی دووەمەوە, ئەویش بەشەددە نووسراوە, چونکە ئیدغامی تەواوە، وەكوو:

| | | | |
|---|---|---|---|
| إِذ ظَّلَمُوٓاْ | بە | إِظَّلَمُوٓاْ | دەخوێندرێتەوە |
| فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ | بە | فَـَٔامَنَطَّآئِفَةٞ | دەخوێندرێتەوە |
| يَلۡهَث ذَّٰلِكَ | بە | يَلۡهَذَّٰلِك | دەخوێندرێتەوە |
| ٱرۡكَب مَّعَنَا | بە | ٱرۡكَمَّعَنَا | دەخوێندرێتەوە |
| وَإِنۡ عُدتُّمۡ عُدۡنَاۚ | بە | وَإِنۡ عُتُّمۡ عُدۡنَاۚ | دەخوێندرێتەوە |

---

(١) التجويد المصور:(صرشمسمیربیسمیر)

ب- ئیدغامی ناتەواو (ادغام ناقص): ئەم جۆرە ئیدغامە لە وشەیەکدا دروست دەبێت, ئەگەر سیفەتەکانی پیتی یەکەم لە سیفەتەکانی پیتی دووەم بەهێزتر بوون، سیفەتە بەهێزەکەی پیتی یەکەم ناچێتە ناو پیتی دووەم, واتە زمانمان بۆ دەرچەی پیتی یەکەم بەرز دەکەینەوە و سیفەتەکەی دەخوێنینەوە, پاشان بەڕووی دەرچەی پیتی دووەمدا دەیکەینەوە، وەکوو:

﴿ أَحَطتُ ﴾ ﴿ لَئِنۢ بَسَطتَ ﴾ ﴿ مَا فَرَّطتُ ﴾

نیشانەی هەر سێ جۆری ئیدغام, (إدغام المتماثلين، إدغام المتقاربين، إدغام المتجانسين) لە قورئاندا:

أ- ئەگەر ئیدغامی تەواو بێت, پیتی یەکەم حەرەکەی نییە و پیتی دووەمیش (شەددە)ی لەسەرە, وەکوو: ﴿ مِن نِّعۡمَةٍ ، يَلۡهَث ذَّٰلِكَ ، بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ ﴾

ب- ئەگەر ئیدغامی ناتەواو بێت, پیتی یەکەم حەرەکەی نییە و پیتی دووەمیش (بێ شەددە)یە, وەکوو: ﴿ أَحَطتُ , بَسَطتَ , مِن وَلِيّ ﴾

## یاساکانی نونی ساکن و تەنوین (أحكام النّون السَّاكنة والتّنوين)

١-نونی ساکن (النون السّاكنة): نونێکی بێ سەروژێرە(حەرەکە)، دەکەوێتە ناوەڕاست یان کۆتایی وشەکەوە، لەگەڵ ناوەکان، وەکوو (سُندُسٍ) و لەگەڵ کارەکان، وەکوو (يَنْهَوْنَ)، هەروەها لەگەڵ پیتەکان، وەکوو(مِنْ)، وێنەکەی لە قورئانی پیرۆزدا بە م جۆرەیە: (نْ، ن، نۡ).

٢- تەنوین (التنوين): نونێکی زیادە و ساکنیشە، لە کۆتایی ناوەکان[1] دەخوێندرێتەوە، بەڵام نانووسرێتەوە، هەروەها ل شوێنی ئەو، حەرەکەی کۆتایی ناو دووبارە دەکرێتەوە.[2]
وەکوو: ـُـ + ن = (ـٌـ ، ـٍـ، ـً)، کاتێك لەسەری دەوەستین، ناخوێندرێتەوە، بەڵام ئەگەر لەسەری نەوەستین، بەم یاسایانە دەخوێندرێتەوە: (الإظهار، الإدغام، الإخفاء، القَلْبُ).

وەکوو:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ﴿عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ | ← | ﴿عَلِيمَنْ حَكِيمًا﴾ | ← | ﴿عَلِيمًا﴾ ﴿حَكِيمًا﴾ |
| ﴿رَؤُوفٌ رَحِيمٌ﴾ | ← | ﴿رَؤُوفُن رَحِيمٌ﴾ | ← | ﴿رَؤُوفٌ﴾ |
| ﴿قَوْلًا سَدِيدًا﴾ | ← | ﴿قَوْلَن سَدِيدًا﴾ | ← | ﴿قَوْلًا﴾ ﴿سَدِيدًا﴾ |
| ﴿آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ﴾ | ← | ﴿آيَاتِن بَيِّنَاتٍ﴾ | ← | ﴿آيَاتٌ﴾ |

### جیاوازیی لە نێوان نونی ساکن و تەنوین

| ژ | نونی ساکن(ن) | تەنوین |
|---|---|---|
| ١ | وێنەکەی لە قورئاندا (نْ ، ن ، نۡ ) | وێنەکەی لە قورئاندا (ـٌـ ، ـٍـ ، ـً) |
| ٢ | دەخوێندرێتەوە و دەنووسرێتەوە | دەخوێندرێتەوە، بەڵام نانووسرێتەوە |
| ٣ | لەگەڵ (ناوەکان، کارەکان و پیتەکان) هاتووە | بەتەنیا لەگەڵ ناوەکان هاتووە |
| ٤ | لە کاتی وەستان و بەیەکگەیاندن، دەخوێندرێتەوە | لە کاتی بەیەکگەیاندن،دەخوێندرێتەوە |
| ٥ | لە ناوەڕاستی وشە یان کۆتایی وشە دەنووسرێتەوە | لە کۆتایی وشەکە دەنووسرێتەوە |
| ٦ | پیتێکی ڕەسەنی وشەکەیە، وەکوو(ینهون) یاخود زیادە لە بنچینەی وشە، وەکوو (ٱنسَلَخَ) | زیادە لە بنچینەی وشەکە |

---

(١) ( تەنوین ) لە قورئانی پیرۆزدا، لە کۆتایی دوو کار هاتووە (لَنَسْفَعًا ، لَيَكُونًا) پێی دەڵێن: (نون التوكيد الخفيفة) هەروەك ئەو تەنوینەی لەگەڵ ناوەکان دەخوێندرێتەوە، وەکوو: (لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ) بە هەڵگەڕانەوە(القلب) دەخوێندرێتەوە، (لَيَكُونًا مِّنَ الصَّاغِرِينَ) بە ئیدغام دەخوێندرێتەوە.

(٢) أحكام قراءة القرآن: (ص[illegible]) ؛ الفوائد التجويدية في شرح المقدمة الجزرية: (ص[illegible])

ئەگەر یەكێك لە پیتە هیجائییەكان لە دوای نونی ساكن [1] , یان تەنوینەوە هاتبیت, ئەوا نونی ساكن و تەنوین, بە جۆرێك لە جۆرەكان ئەم یاسایان دەخوێندرێنەوە:

| ئاشكرا كردن (الإظهار) | تێكهەڵكێشان (الإدغام) | هەڵگەڕانەوە (القلب) | شاردنەوە (الإخفاء) |
|---|---|---|---|

ئیمامی جەزەری دەڵێت:

وَحُكْمُ تَنْوِينٍ وَنُونٍ يُلْفَى ......... إِظْهَارٌ إدغام وَقَلْبٌ إِخْفا [2]

**زانیاری**

أ- ئەم چوار یاسایە لەگەڵ نون دەخوێندرێنەوە, چونكە نون دوو دەرچەی هەیە:
أ- سەری زمان لەگەڵ بنی ددانەكانی سەرەوە(دەم). ب- بۆشایی لووت
نون تا ئەو كاتەی لە هەردوو دەرچەكە دەردەچێت, لەسەر كاریگەری پیتی دوای نون لەسەر نون دەوەستێت, هەروەها دووری و نزیكی لە نێوانیاندا, دەبێتە هۆی پەیداكردنی یەكێك لەم چوار یاسایانە:
أ- ئەگەر پیتی نون لە پیتی دوای خۆیەوە نزیك بێت, یان وەك خۆی بێت, ئەوا دەبێتە ئیدغام.
ب- ئەگەر پیتی نون لە پیتی دوای خۆیەوە دوور بێت, ئەوا دەبێتە(اظهار).
ج- ئەگەر پیتی نون, لە پیتی دوای خۆی دوور نەبێت, نزیكیش نەبێت, ئەوا دەبێتە ئیخفاء, واتە لە نێوان ئیدغام و (اظهار)دا.
د- هەڵگەڕانەوە (القلب) ڕێگایەكە بۆ گەیشتن بە (**إخفاء**)(ئیخفائی لێوەكان).

---

(أ) لە پیتە هیجائییەكان, تەنیا پیتی ئەلیف دوای نوی ساكن نانووسرێتەوە، چونكە ئەلیف پیتێكی ساكنە و لە زمانی عەرەبیدا, دروست نییە دوو پیتی ساكن لە دوای یەكتری بنووسرێن، تەنیا پیتێكی بەفەتحە پێش ئەلیف دەنووسرێت.

(ب) المقدمة الجزرية / لە

ت- ئاشكراكردن (الإظهار): بریتییە لە خوێندنەوەی نونی ساكن (ن) یان نونی تەنوین

( ــًــٍــٌ ) بە شێوەیەكی دیار و ئاشكرا و بەبێ درێژكردنەوەی مینگە(الغنە), ئەگەر پیتێكی(اظهار), لە دوای نون یان تەنوینەوە هاتبێت, جا چ لە یەك وشە یان دوو وشەدا بێت. پیتەكانی (اظهار)یش بریتین لەمانە:( ء ، هـ ، ع ، ح ، غ ، خ )

| پیت | نونی ساكن( نْ ) لە پێش پیتی (اظهار) | | تەنوین ( ــًــٍــٌ ) لە پێش پیتی (اظهار) |
|---|---|---|---|
| ء | يَنْـَٔوْنَ | فَلَنْ أَبْرَحَ | كُلٌّ ءَامَنَ |
| هـ | يَنْهَوْنَ | مَنْ هَاجَرَ | وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ |
| ع | أَنْعَمْتَ | مِنْ عَلَقٍ | حَكِيمٌ عَلِيمٌ |
| ح | يَنْحِتُونَ | مِّنْ حَكِيمٍ | عَيْنٍ حَمِئَةٍ |
| غ | فَسَيُنْغِضُونَ | مِنْ غَيْرِ | قَوْمًا غَيْرَكُمْ |
| خ | وَٱلْمُنْخَنِقَةُ | مِّنْ خَوْفٍ | طَرْفٍ خَفِيٍّ |

كُلٌّ ءَامَنَ ← كُلُّنْ ءَامَنَ

طَرْفٍ خَفِيٍّ ← طَرْفِنْ خَفِيٍّ



نیشانەی (إظهار) لە قورئاندا, نون, سكونی لەسەرە، وەكوو ( نْ )، تەنوینیش, ئەگەر دوو فەتحە و دوو كەسرەبن, سەرەكانیان دەكەونە بەرامبەر یەكتری و لە شوێنی تەنوینی (ضمة), نونێكی سووڕاوی لەسەر (ضمة)ەیە، وەكوو: (ــًــٍــٌ).

**یڕ- تێکهەڵکێشان (الإدغام):** ئەگەر پیتێکی ئیدغام دوای نونی ساکن (ن) یان دوای تەنوینەوە (ـًـٍـٌ) هاتبێت, ئەوا نونی ساکن یان نونی تەنوین تێکهەڵکێشی پیتی ئیدغام دەکەین و پیتی ئیدغام دەبێتە پیتێکی بەشەددە(*1).

بۆ زانین: ئیدغام لە نێوان دوو وشەدا دروست دەبێت.

**پیتەکانی ئیدغامیش شەشن, کە بریتین لەمانە:**

( ي ، ر ، م ، ل ، و ، ن ) لە وشەی (يَرمُلون) کۆکراونەتەوە.

هوکارەکانی ئیدغامی نون یان تەنوین, چونکە ئەو پیتەی بەدوای دا دێت, هاوشێوەی نونە, وەکوو پیتی(ن), یان لە نونەوە نزیکە, وەکوو پیتەکانی(یرملو).

**جۆرەکانی ئیدغام**

**ڕ- تێکهەڵکێشانی بە غوننە (إدغام بغنة)** پیتەکانی بریتین لە:
( ن ، م ، ي ، و )

**یڕ- تێکهەڵکێشانی تەواو و بێ غوننە (إدغام بلاغنة)** پیتەکانی بریتین لە:( ل ، ر )

**أ ـ إدغام كامل بغنة:**
تێکهەڵکێشانی تەواو و بەغوننە،
پیتەکانی بریتین لە:( م ، ن)

**ب ـ إدغام ناقص بغنة:**
تێکهەڵکێشانی ناتەواو و بەغوننە،
پیتەکانی بریتین لە:( و ، ي)

---

(1) أحكام قراءة القرآن الكريم:(صـ٢٣-٢٤)

×× ئەگەر دوای نونی ساکن یان تەنوین پیتێکی ساکن هاتبێت, دەبێتە یەکێك لە دوو پیتە ساکنەکان (**التقاء الساكنين**), ئا لەوکاتەدا نونی ساکن حەرەکەیەك وەردەگرێت و بە هیچ یاسایەکی نون و تەنوین ناخوێندرێتەوە, وەکوو: ﴿مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ﴾﴿إِفۡكٌ ٱفۡتَرَىٰهُ﴾﴿قُلۡ إِنِ ٱفۡتَرَيۡتُهُۥ﴾

لە لاپەڕە (سمیڕ)دا بەدرێژی بابەتی (**التقاء الساكنين**) دەبینی.

**أ ـ إدغام كامل بغنة:** بریتییە لە تێکهەڵکێشکردنی نونی ساکن ( ن ), یان نونی تەنوین ( ـًـٍـٌ ), بۆ ناو پیتەکانی ( م، ن ), تێکهەڵکێشکردنێکی تەواو، واتە نونی ساکن بە دەرچە و سیفەتەوە, دەچێتە ناو ئەو پیتەی کە بە دوایدا هاتووە، خوێنەر یەکسەر لە پیتی پێش نون یان تەنوینەوە دەچێتە پیتی دواى ئەوان (پیتی ئیدغام), هەروەها مینگە (الغنّة) بەدرێژی دەخوێندرێتەوە(1) بەپێی خێرایی خوێندنەوەکە,(2) , بۆ زانین: ئەم غوننەیەی کە لەگەڵ ئەم یاسایە دەخوێندرێتەوە, غوننەی پیتی ئیدغامە, نەك غوننەی نون، بۆیەش پێی دەڵێن ئیدغامی تەواو(3).

| نونی ساکن ( ن ) لە پێش پیتەکانی( م ، ن ) | | | تەنوین ( ـًـٍـٌ ) لە پێش ( م ، ن ) | |
|---|---|---|---|---|
| پیتەکانی ئیدغام | نموونە لە قورئاندا | دەخوێندرێتەوە | نموونە لە قورئاندا | دەخوێندرێتەوە |
| م | مِن مَّارِجٍ | مِمَّارِجٍ | فِي كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ | فِي كِتَٰبِمَّكْنُونٍ |
| ن | لَن نَّبْرَحَ | لَـنَّبْرَحَ | سُلْطَٰنًا نَّصِيرًا | سُلْطَٰنَنَّصِيرًا |

مِـمَــــمَارِجٍ
غوننە
غوننەی درێژ لەگەڵ سکونی میم

لَـنْــــنَبْرَحَ
غوننە
غوننەی درێژ لەگەڵ سکونی نون

چونکە نونی ساکن و نونی ئیدغام هاوشێوەن و دەرچەی نونی ساکنیش نزیکە لە دەرچەی میمەوە و یەك سیفەتیشیان هەیە, بۆیە دەبێتە ئیدغامی تەواو.

---

(1) هەندێك زانا دەڵێن غوننە بە دوو حەرەکە درێژ دەکرێتەوە, وەکوو: المرعشى لە (جهد المقل)دا هەروەها شێخ إبراهيم السَّمَنُّوديش, بەڵام باشتر وایە بەپێی خێرایی خوێندنەوە درێژ بکرێتەوە، چونکە ئەگەر تەواو بێت, زیاتر لە دوو حەرەکە درێژ دەکرێتەوە, واتە زیاتر لە مەددی ئاسایی, کە هەموو زاناکان کۆدەنگن لەسەر دوو حەرەکەکەی.

(2) خێرایەکانی کە قورئانی پێ دەخوێندرێتەوە, سیانن: ( تر- التَّحقيق، ير- التَّدوير،سم- الحدر ) پێناسەکانیان لە لاپەرە (ير) دا دەبینیت.

(3) بەپێی بووچۆنی هەندێك زانا, ئیدغام لەگەڵ ئەم دوو پیتە (ن ، م), ئیدغامێکی ناتەواوە, بۆیە ئەو غوننەیەی کەلەو کاتەدا دەخوێندرێتەوە, غوننەی پیتی نونە, بەڵام بووچۆنی ئیدغامی تەواو لەگەڵ (ن , م) بەهێزتر و باوترە.

**ب- إدغام ناقص بغنة:** تێکهەڵکێشکردنی نونی ساکن ( ن ) یان نونی تەنوین (ـً ـٍ ـٌ) بۆ ناو پیتەکانی ( و ، ي ), بەڵام تێکهەڵکێشکردنێکی ناتەواو, واتە نونەکە دەچێتە ناو پیتی ئیدغامەکەدا (وەك دەرچە), بەڵام سیفەتەکەی, کە مینگە (الغُنَّة)یە, نابێتە ئیدغام و بەدرێژی دەمێنێتەوە.[1]

| نونی ساکن(ن) لە پێش پیتەکانی(و ،ي) | | | تەنوین ( ـً ـٍ ـٌ )لە پێش پیتەکانی( و ،ي) | |
|---|---|---|---|---|
| **پیتەکانی ئیدغام** | **نموونە لە قورئاندا** | **دەخوێندرێتەوە** | **نموونە لە قورئاندا** | **دەخوێندرێتەوە** |
| ي | مَن يَشَآءُ | مَيَّشَآءُ | خَيْرًا يَرَهُ | خَيْرَيَّرَهُ |
| و | مِن وَالٍ | مِوَّالٍ | وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ | وَلِكُلِّنْ وِّجْهَةٌ |

مَـيـــــــيَشَآء
غوننە
غوننەی درێژ لەگەڵ سکونی (یاء)

مِـوَّـــــــوَال
غوننە
غوننەی درێژ لەگەڵ سکونی (واو)

چونکە دەرچەکانی پیتی نون و پیتی ئیدغام زۆر لە یەکەوە نزیك نین, بەڵام هەندێك لە سیفەتەکانیان یەکن, تەنیا سیفەتی غوننە نەبێت, ناچێتە ناو پیتی ئیدغامەوە و دەبێتە هۆی پەیدابوونی ئیدغامی ناتەواو.

---

(تێ) غوننە لەگەڵ (واو و یاء)ی یەکەمی ساکن دەخوێندرێنەوە، بەڵام ئەگەر غوننە بە تەواوی خوێندرایەوە, پێویستە هەردوو پیتی (واو و یاء)ی دووەم, ئەوانەی بەسەرو ژێر (متحرك)ن, بەبێ غوننە بخوێندرێنەوە.

**یر– إدغام کامل بلا غنة:** تێکهەڵکێشکردنی نونی ساکن ( ن ) یان نونی تەنوین (ـــً ـٍ ـٌ) بە دەرچە و سیفەتەوە بۆ ناو پیتەکان ( ل ، ر ), واتە لە پیتی پێش نون و تەنوینەوە یەکسەر دەچینە ناو ئەو پیتەی بەدوایدا دێت (پیتی ئیدغام) و دەبێتە (إدغام بلا غُنَّة) و بەدرێژی لەسەری ناوەستین، چونکە غوننەی لەگەڵی ناخوێندرێنەوە.

| پیتەکانی ئیدغام | نموونە لە قورئاندا | دەخوێندرێتەوە | نموونە لە قورئاندا | دەخوێندرێتەوە |
|---|---|---|---|---|
| نونی ساکن(ن) لە پێش پیتەکانی(ل ، ر) | | | تەنوین (ـــً ـٍ ـٌ) لە پێش پیتەکانی(ل ، ر) | |
| ل | مِن لَّدُنۡهُ | مِلَّدُنۡهُ | إِصۡلَاحٞ لَّهُمۡ | إِصۡلَاحُلَّهُمۡ |
| ر | مِن رَّبِّهِمۡۖ | مِرَّبِّهِمۡۖ | غَفُورٗا رَّحِيمٗا | غَفُورَرَّحِيمٗا |

مِن لَّدُنۡهُ ← مِلۡلَدُنۡهُ
لەسەر لامی ساکن ناوەستین

مِن رَّبِّهِمۡۖ ← مِرۡرَبِّهِمۡ
لەسەر رائی ساکن ناوەستین

چونکە پیتی نون زۆر نزیکە لە هەردوو پیتی(ل ، ر), بۆیە بە دەرچە و سیفەتەوە دەچێتە ناو پیتی ئیدغام و دەبێتە ئیدغامی تەواو.

**بۆ زانین:** لە ریوایەتی (حفص)دا, بە رێگای (شاطبي)بە تەنیا لە ئایەتی﴿وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ﴾ (القيامة:٢٧) پیتی نون لەگەڵ پیتی (راء) ئیدغام نابێت, چونکە سەکتە پیتەکان لە یەکتری دوور دەخاتەوە.



**نیشانەی ئیدغام لە قورئانی پیرۆزدا:** پیتی (ن) بێ حەرەکەیە، تەنوینی فەتحە و تەنوینی کەسرەش, سەرەکانیان بەرامبەر بە یەکتری نین و دوو (ضمَة)ش لە تەك یەکەوەن، وەك ( ـــً ـٍ ـٌ )، و پیتەکانی ئیدغام( ل ، ر ، م ، ن ) شەددەیان لەسەرە, بەڵام پیتەکانی( و، ي )شەددەیان لەسەر نییە، چونکە ئیدغامەکەیان ناتەواوە.

## ئەو جێیانەی ئیدغامی تێدا ناخوێندرێتەوە

- لە یەك وشەدا
- لە دوو وشەدا

**تر- لە یەك وشەدا:** ئیدغامی نون و تەنوین بەتەنیا لە نێوان دوو وشەدا دروست دەبێت, واتە لە وشەیەكدا نابێت بە ئیدغام, بۆیە بە ئاشكرا **(إظهار)** دەخوێندرێتەوە(1).

**نموونة**

﴿ ٱلدُّنۡيَا ﴾ ﴿ قِنۡوَانٌ ﴾ ﴿ صِنۡوَانٍ ﴾ ﴿ بُنۡيَٰنٌ ﴾

**بۆ زانین:** تەنیا ئەم چوار وشەیە لە قورئاندا هاتوون, كە نونی ساكن كەوتووەتە پێش پیتی ئیدغامەوە لە وشەیەكدا و بەئاشكرا **(إظهار)**دەخوێندرێتەوە.

**یر- لە نێوان دوو وشەدا:** لە ڕیوایەتی (حفص)دا بە ڕێگای **(شاطبي)**, لە دوو ئایەتدا نونی ساكن بە(اظهار)دەخوێندرێتەوە, كاتی بەیەكگەیاندن(2) , ئەو دوو ئایەتەش ئەمانەن:

تر- ﴿ يسٓ ١ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ ﴾
یر- ﴿ نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ﴾

نون لەگەڵ(یاسین, نون) لەگەڵ(واو) ئیدغام نابن, بەڵكوو تەنیا بە**(إظهار)** دەخوێندرێنەوە.

**زانیاري**

لە سەرەتای (سورة الشّعراء و سورة القصص) وشەی (طسٓمٓ), نونی (سین) لەگەل (میم) ئیدغامدەكرێت, چونكە لە بنچینەدا دوو وشەی لێك جیان.

---

(تر)(یر) المنح الفكريه:(صترتریر) ؛ هدابه القارى:(صسم□تر-له□تر)

سێ- هەڵگەڕانەوە (القلب) لەڕووی زمانەوانییەوە[1]: بریتییە لە پێچەوانەکردنەوە.

لەڕووی زاراوە (اصطلاحًا)وە: بریتییە لە گۆڕینی نونی ساکن, یان نونی تەنوین (ـًـٍـٌ) بۆ پیتی (میم), ئەگەر پیتی (باء) بەدوایدا هاتبێت و پاشان پیتی (میم) بە ئیخفائی لێوەکان دەخوێندرێتەوە لەگەڵ درێژکردنەوەی غوننە,[2] ئەم یاسایە هەم لە نێوان وشەیەکدا دروست دەبێت, هەمیش لە نێوان دوو وشەدا دروست دەبێت, وەکوو:

| نونی ساکن( نْ )لە پێش پیتی(ب) | | تەنوین ( ـًـٍـٌ ) لە پێش پیتی(ب) | |
|---|---|---|---|
| مِنۢ بَعْدِ | مِمبَعد | سَمِيعُۢ بَصِيرٌ | سَميعُم بَصِير |
| أَنۢ بُورِكَ | أَمبُورِك | ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٍ | ءَايَٰتِم بَيِّنَٰتٍ |
| لَيُنۢبَذَنَّ | لَيُمبَذَنَّ | ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا | ضَلَالَم بَعِيدًا |

مِمــــــبَعْدِ
غوننە
غوننەی درێژ لەگەڵ میمی گۆڕاو لە نونەوە

لَيُمــــــبَذَنَّ
غوننە
غوننەی درێژ لەگەڵ میمی گۆڕاو لە نونەوە

نیشانەی هەڵگەڕانەوە لە قورئاندا, میمێکی بچووک لەسەر نونەکە هەیە، وەکـوو: ( نۢ )، هـەروەها لـە شـوێنی تـەنوین, مـیمێکی بچـووک لـە تـەک حەرەکەیەکەوەیە، وەکوو: ( ـًۢـٍۭـٌۢ )، هەروەها پیتی (ب) شەددەی نییە.

**زانیاری**

پیتی (نون) لەگەڵ پیتی (باء) (إدغام) نابێت،
1- چونکە (نون) و (باء) دەرچەیان یەك نییە و لەیەك نێزیکیش نین.
2- چونکە (غنّە)ی نون ون دەبێت, و وشەکە تێك دەشێوێت.
بۆیە دەگۆڕدرێت بۆ میم و پاشان بە ئیخفائی لێوەکان دەخوێندرێتەوە, چونك نون لەلایەن(غنّە)وە وەکوو میم وایە و لەلایەن دەرچەوە هەمان دەرچەی (باء)ە.

---

(1) بە (الاقلاب) باو بووە, بەڵام دروستەکەی (القلب)ە.   (2) نهایە القول المفید:(ص[illegible]).

شم- شاردنەوە (**الإخفاء**) لەڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە شاردنەوەی هەر شتێك.

لەڕووی زاراوەوە: بریتییە لە شاردنەوەی نونی ساکن (ن) یان نونی تەنوین (ـًـٍـٌ)ە, لە نێوان (**إدغام و اظهار**)دا, ئەگەر یەکێك لە پیتەکانی (ئیخفاء)بەدوایدا هاتبێت, لەگەڵ درێژکردنەوەی غوننە.

بۆ زانین: ئیخفاء لە نێوان وشەیەك و دوو وشەشدا دروست دەبێت, پیتەکانی ئیخفائیش بریتین لەمانە: (ص، ذ ، ث ، ک ، ج ، ش ، ق ، س ، د ، ط ، ز ، ف ، ت ، ض، ظ)

ئیمام(سليمان الجَمزوري), ئەم پیتانەی لە سەرەتای وشەکانی ئەم دێڕە شیعرەدا نووسیوە:

> صِفْ ذَا ثَنَا كَمْ جَادَ شَخْصٌ قَدْ سَمَا ...... دُمْ طَيِّبًا زِدْ فِي تُقًى ضَعْ ظَالِما

## چۆنیەتی خوێندنەوەی ئیخفاء:

تر- کاتێك پیتی پێش نون دەخوێندرێتەوە, یان حەرەکەی یەکەم لە تەنوین, دەممان بۆ پیتی دوای نون و تەنوین (بۆ پیتی ئیخفاء) ئامادە دەکەین, هەروەها لەگەڵ خوێندنەوەی غوننەیەکی درێژ، ئەگەر غوننەکە تەواو بوو, ئینجا پەستان دەخەینە سەر دەرچەی پیتی (ئیخفاء) و بە جیا و بەبێ (غوننە) دەخوێندرێتەوە.

یر- پێویستە زمان نزیك بێت لە دەرچەی ئەم پیتانە: ( ط ، د ، ت ، ج ) چونکە کاتێك زمان لەسەر دەرچەی ئەم پیتانە دادەنێین, دەبێتە (**إظهار**).

سم- ئیخفاء لەگەڵ پیتەکانی (ق ، ك), زمان لەسەر دەرچەی هەردوو پیتەکە دادەنێین (پێوە دەلکێت) و غوننەکە درێژ دەکەینەوە, کاتێك غوننەکە تەواو دەبێت, یەکسەر پیتەکانی (ق ، ك)ی بەسەرو ژێر دەخوێنینەوە.

**نموونة**

تَنظُرُونَ

تَـــــظُرُونَ (غوننە)

غوننەی درێژ لە نێوان (تاء) و (ظاء)دا

مِن ثَمَرَةٍ

مِـــــثَمَرَةٍ (غوننە)

غوننەی درێژ لە نێوان (میم) و (ثاء)دا

( رَسُولًا شَهِدًا ) ← رَسُولَ ـــــ شَهِدًا (غوننە)

غوننەی درێژ لە نێوان (لام) و (شین)دا

## پلەکانی خوێندنەوەی ئیخفاء:

یەکەم- بەرزترین پلەی ئیخفاء, ئەگەر دوای نونی ساکن و تەنوین, پیتەکانی: (ط،ت،د، ت)هاتبن, کە (إخفاء), زیاتر لە (إدغام)ەوە نزیك دەبێت، بە هۆی نزیکبوونەوەی نون لەم پیتانەوە.

دووەم- پلەی ناوەند, ئەگەر دوای نونی ساکن و تەنوینەوە ئەم پیتانە هاتبن:
(ص ، ذ ، ث ، ج ، ش ، س ، ز ، ف ، ض، ظ ), چونکە مەودایەکی مامناوەند دەکەوێتە نێوان دەرچەی نون و دەرچەی ئەم پیتانەوە.

سێیەم- پلەی لە هەموان کەمتر, کە زیاتر لە(إظهار)ەوە نزیکە, ئەگەر دوای نونی ساکن و تەنوین, هەردوو پیتی(ق، ك)هاتبن، چونکە دەرچەی (نون) لە دەرچەی(ق, ك) دوورە.[1]

**تێبینی**

یەکەم- پێویستە قورئانخوێن لە کاتی خوێندنەوەی نونی ئیخفائکراودا وریا بێت, سەری زمانەکەی نەگەیەنێت بە پووکەکانی ددانەکانی سەرەوە (دەرچەی نون)، چونکە دەبێتە نونێکی ئاشکرا لەگەڵ غوننە (إظهار بغنة)وخوێندنەوەیەکی ناڕاست و نادروستیشە.
دووەم- پێویستە هیچ پیتێکی مەدد لەپێش غوننەی درێژکراو نەخوێندرێنەوە , وەکوو:
(أَنتُم ← آنتُم ) (كُنتُم ← كُونتُم) (مِنكُم ← مِينكُم)

غوننە هەندێك جار بەسووکی دەخوێندرێتەوە, هەندێك جاریش بەقەڵەوی دەخوێندرێتەوە, ئەوەش لەسەر پیتی دوای نون و تەنوین دێت دەوەستێت، واتە لەگەڵ ئەم پێنج پیتەی(إخفاء)ی قەڵەو, غوننە بە قەڵەو دەخوێندرێتەوە: ( ص ، ض ، ط ، ظ ، ق ) وەکوو:
﴿مِن صَلۡصَٰلٖ﴾ ﴿مِن قَبۡلُ﴾ ﴿بَلۡدَةٞ طَيِّبَةٞ﴾
غوننە لەگەڵ گشت پیتەکانی دیکە, بەسووکی دەخوێندرێتەوە، وەکوو:
﴿ لِمَن شَآءَ ﴾ ﴿مِن دُونِهِۦ ﴾ ﴿ فَمَن يَعۡمَلۡ ﴾ ﴿ٱلنَّاسِ﴾



نیشانەی (ئیخفاء) لە قورئانی پیرۆزدا: پیتی (ن) بێ حەرەکەیە، تەنوینی فەتحە و تەنوینی کەسرەش, سەرەکانیان بەرامبەر بە یەکتری نین و دوو (ضمة)ش لە تەك یەکەوەن، وەك ( ـٌ )، و پیتەکانی ئیخفاء شەددەیان لەسەرە نییە.

---

(1) جهد المقل:(ص له) ؛ الفوائد التجويديه :(ص٤٣).

## نموونە لەسەر شاردنەوە (الإخفاء)

| پیت | پیتی (ن) ی ساکن لە پێش پیتی ئیخفا: لە وشەیەکدا | لە دوو وشەدا | تەنوین لە پێش پیتی ئیخفا: لە دوو وشەدا |
|---|---|---|---|
| ص | مَنصُورًا | مِن صَلۡصَٰلٍ | رِيحًا صَرۡصَرًا |
| ذ | فَأَنذَرۡتُكُمۡ | مِن ذَهَبٍ | يَتِيمًا ذَا مَقۡرَبَةٍ |
| ث | مَنثُورًا | مِن ثَمَرَةٍ | مَآءً ثَجَّاجًا |
| ك | وَلَا يَحۡزُنكَ | وَلَٰكِن كَانُوٓاْ | جِبِلًّا كَثِيرًاۖ |
| ج | وَأَنجَيۡنَا | إِن جَآءَكُمۡ | فَصَبۡرٌ جَمِيلٌ |
| ش | إِنشَآءً | لِمَن شَآءَ | رَسُولًا شَٰهِدًا |
| ق | فَٱنقَلَبُواْ | مِن قَرۡيَةٍ | مَّكَانٍ قَرِيبٍ |
| س | ٱلۡإِنسَٰنِ | مِن سُندُسٍ | قَوۡلًا سَدِيدًا |
| د | أَندَادًا | مِن دُونِهِ | قِنۡوَانٌ دَانِيَةٌ |
| ط | يَنطِقُونَ | مِن طِينٍ | كَلِمَةً طَيِّبَةً |
| ز | تَنزِيلًا | مِن زِينَةٍ | نَفۡسًا زَكِيَّةً |
| ف | أَنفُسَكُمۡ | كُن فَيَكُونُ | سُبُلًا فِجَاجًا |
| ت | كُنتُمۡ | لَن تَبُورَ | حِلۡيَةً تَلۡبَسُونَهَاۖ |
| ض | مَنضُودٍ | بِمَن ضَلَّ | مَسۡجِدًا ضِرَارًا |
| ظ | تَنظُرُونَ | مِن ظَهِيرٍ | ظِلًّا ظَلِيلًا |

## یاساکانی میمی ساکن (أحكام الميم الساكنة)

میمی ساکن: بریتییە لە پیتێك, کە لە کاتی وەستان و بەیەکگەیاندنیش ساکنە, لەگەڵ ناوەکان هاتووە, وەکوو: (لَهُ الحَمۡدُ), لەگەڵ کارەکانیش هاتووە, وەکوو: (يَعۡتَصِمۡ), لەگەڵ پیتەکانیش هاتووە, وەکوو: (أم لَمۡ يُنَبَّأ), جا چ لە ناوەڕاستی وشە بێت وەکوو: (قُمۡتُمۡ) یان کۆتایی وشەکەدا بێت، وەکوو: میمی کۆ (كُنتُمۡ), یاخود میمی تاك (أَحۡكُمۡ ).

ئەگەر دوای میمی ساکن, یەکێك لە پیتەکانی هیجاء هاتبێت[1] , پیتی (میم) بە یەکێك لەم سێ یاسایانە دەخوێندرێتەوە[2]

- تێکهەڵکێشان (الإدغام الشَّفوي)
- شاردنەوە (الإخفاء الشَّفوي)
- ئاشکراکردن (الإظهار الشَّفوي)

ﭐ- تێکهەڵکێشان (الإدغام): ئەگەر میمێکی بەسەروژێر(متحرك), دوای میمێکی ساکن هاتبێت, میمە ساکنەکە تێکهەڵکێشی میمی (متحرك)دەکەین و دەبێتە میمێکی بەشەددە و غوننەکەیشی بەدرێژی دەخوێندرێتەوە، کە پێی دەڵێن: تێکهەڵکێشانی زارەکی (الإدغام الشفوي) وەکوو:

﴿ فَمِنۡهُم مَّنۡ ءَامَنَ ﴾ ﴿ أَم مَّاذَا ﴾ ﴿أَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾ ﴿كَم مِّن فِئَةٖ ﴾

نیشانەی ئیدغامی میم لە قورئاندا, میمی یەکەم بێ حەرەکەیە, بەڵام ئەو میمەی بەدوایدا دێت (شەددە)ی لەسەرە.

---

(ﭐ) لە پیتە هەجائییەکان, بەتەنیا پیتی ئەلیف دوای میمی ساکن نانووسرێت، چونکە ئەلیف پیتێکی ساکنە و لە زمانی عەرەبیدا دروست نییە دوو پیتی ساکن لە دوای یەکتری بنووسرێن، بۆیە بەس پیتێکی بەفەتحە پێش ئەلیف دەنووسرێت.

(ﭑ) هدایە القاری:(صەسمنیﭐشمنیﭐ)

یـ- شاردنەوە (الإخفاء ): ئەگەر میمێکی ساکن, دوای پیتی (باء)ی بەسەرو ژێر (متحرك) هاتبێت, پیتی میم (م) دەشاردرێتەوە بە(الإخفاء الشفوي) و بەم شێوەی خوارەوە:

تـ- بۆ خوێندنەوەی پیتی میم و پیتی باء تەنیا یەكجار لێوەكان بەریەك دەكەون.

یـ- پاڵەپەستۆ ناكەوێتە سەر دەرچەی میمەكە (لای لێوەكان لە دەرەوە).

سمـ- كە پیتی پێش (میم) دەخوێندرێتەوە، خوێنەرەكە لێوەكانی خۆی لەسەریەك دادەنێت و لەگەڵیشیدا غوننەكە بەدرێژی دەخوێنێتەوە و دوای ئەوەش كە غوننەكەی تەواو كرد، ئینجا پیتی باء دەخوێنێتەوە، وەكوو:

﴿ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ ﴾﴿ تَرۡمِيهِم بِحِجَارَةٖ ﴾﴿ يَوۡمَ هُم بَٰرِزُونَ ﴾﴿وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ ﴾

تَرۡمِيهِمـــــــبِحِجَارَةٖ
غوننە
غوننەی درێژ لە پیتی میمەوە تا پێش باء

وَفِي ذَٰلِكُمـــــبَلَآءٞ
غوننە
غوننەی درێژ لە پیتی میمیەوە تا پێش باء

**زانیاري**

پیتی (میم) لەگەڵ پیتی (باء) بە(إظهار) ناخوێندرێنەوە، چونكە بۆ خوێندنەوەی هەردوو پیتەكە, دوو جار (لێو)ەكان بەریەك دەكەون و ئەم جۆرە خوێندنەوەیە بۆ خوێنەر قورس دەبێت, ﴿ يَوۡمَ هُم بَٰرِزُونَ ﴾

**زانیاري یـ**

پیتی (میم) لەگەڵ پیتی (باء) ئیدغام نابێت، چونكە غوننە نامێنێت و دەبێتە (إدغام كامل) و دەرچەكان دادەخرێن، وەكوو: ﴿ تَرۡمِيهِم بِحِجَارَةٖ ﴾ دەبێتە: (ترميهِبِّحجارة).

سمـ- ئاشكراكردن (الإظهار): بریتییە لە خوێندنەوەی (م)ی ساكن بەشێوەیەكی دیار و ئاشكرا لە دەرچە سەرەكییەكەیدا, كە لێوەكانن, ئەگەر دوای میمەكە هەموو ئەو پیتانەی كە ماون هاتبن, جگە لە هەردوو پیتەكانی(م، ب), بەڵام غوننە بەدرێژی ناخوێندرێتەوە، بۆیە پێی دەڵێن دیارخستنی زارەكی(الاظهار الشفوي), وەكوو:

﴿ إِنۡ كُنتُمۡ خَرَجۡتُمۡ ﴾ ﴿كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾﴿ مَا لَكُمۡ كَيۡفَ ﴾﴿ وَأَمۡوَٰلِهِمۡ ﴾

**تێبینی**

پێویستە وریابین, کە پیتی (میم) دەکەوێتە پێش پیتەکانی (ف ، و), دەبێت بەئاشکرا بخوێندرێتەوە[1] و نەکەوینە ناو ئەم دوو هەڵەوە:

١- پیتی(م) لەگەڵ پیتی(فاء), نەشاردرێتەوە, تاکوو وەك ئیخفائی نونی لێ نەیەت.

٢- پیتی(م) لەگەڵ پیتی (واو) ئیدغام نەکرێت, چونکە وەکوو ئیدغامی نونی لێ دێت[2] و مانای کۆ نابەخشێت.

بۆیە پێویستە پیتی (میم) بە(إظهار) بخوێندرێتەوە, چونکە پیتی میم لە پیتەکانی (ف , و) بەهێزترە, پیتی بەهێزیش ناچێتە ناو پیتی بێهێزەوە.

﴿ ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ وَيَمُدُّهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴾ (البقرة : ١٥)

**پیتی میم بەئاشکرا دەخوێندرێتەوە**

**ئیمامی جەمزوری دەڵێت**[3]:

واحذَر لَدَى واوٍ وفَا أن تختَفِي ....... لِقُربِها وَلإتحادٍ فاعرِفي

﴿قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡ أَئِن ذُكِّرۡتُمۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ١٩﴾ (يس:١٩)

إدغام شفوي — إظهار شفوي — إخفاء شفوي — إظهار شفوي

﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٞ تَنتَشِرُونَ ٢٠﴾ (الروم:٢٠)

إظهارحقيقي — إدغام شفوي — إخفاء حقيقي — إخفاء شفوي

---

(١) التمهيد في علم التجويد:(ص١٥٣)
(٢) البرهان في تجويد القرآن:(ص١٢)
(٣) تحفة الاطفال/١٣

## خوێندنەوەی پیتەکانی (مّ ، نّ)ی بەشەددە

**شەددە ( ّ ):** بریتییە لە نیشانێك, زانای بەناوبانگ (الخليل بن أحمد الفراهيدی ) ئەو نیشانەی لەسەر ئەو پیتانەی داناوە, کە لە دوو پیت پێکهاتوون, پیتی یەکەم ساکن و پیتی دوومیش بەسەروژێرە (متحرك)، پیتی ساکن چووەتە ناو پیتی دواتردا و بووەتە پیتێکی گیرەدار(موشەددەت).

بۆ خوێندنەوەی (مّ ، نّ )ی بەشەددە, پێویستە لەسەر دەرچەی هەردوو پیتەکە بوەستین و غوننەکەیان لەهەر شوێنێکی وشەدا بەدرێژترین پلە بخوێندرێتەوە, بەڵام بۆ خوێندنەوەی گشت پیتەکانی دیکەی گیرەدار (مشدد), لەسەریان ناوەستین, تەنیا وەك دوو پیت دەخوێندرێنەوە (پیتێکی ساکن و پیتێکیش بەسەروژێر).

ئیمامی جەمزوری دەڵێت[1]:

وَغُنَّ نونًا ثم ميمًا شُدِّدا ...... وَسَمِّ كُلا حَرفَ غُنَّةٍ بَدا

نموونة

﴿فَأَتَمَّهُنَّ﴾ ﴿فِي ٱلْيَمِّ﴾ ﴿وَلَا جَآنٌّ﴾ ﴿إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ﴾

---

(1) تحفة الاطفال/ت٢

## پلەکانی مینگە (الغنَّة) ی پیتەکانی (م ، ن)

زانایانی زمان و تەجوید چەندین بووچوونی جیاوازیان هەیە بۆ پلەکانی مینگە (الغنّة) بەپێی هێزی غوننە و ماوەی درێژکردنەوەی، بەم شێوەی خواریەوە:

أ - ئیمامی (شاطبي) دەڵێت (غوننە)کان سێ پلەن: ١- غوننەی نون و میمەکانی بەشەددە ٢- (غوننە)لەگەڵ تێکهەڵکێشان(ئیدغام)ی(واو)و یا ء ٣- (غوننە) لەگەڵ شاردنەوە (ئیخفاء).

ب- زۆر زانا دەڵێن غوننەکان پێنچ پلەن[1]: هەر سیانی ئیمامی (شاطبي)٤- غوننەی نون و میمەکانی بە(اظهار)دەخوێندرێنەوە ٥- غوننەی نون و میمەکانی بەسەروژێر (متحرك) دەخوێندرێنەوە.

ج- ئیمام (برهان الدين إبراهيم بن عمر الجَعبَري) دەڵێت: چوار پلەن, کە لەم پەرتووکەدا بووچوونی ناوبراومان پەیرو کردووە, بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- بەرزترین پلە: غوننە لەگەل پیتەکانی (نّ , مّ) (مشدد), یان لەگەڵ دوو پیتی تێکهەڵکێش (ئیدغام)کراو, وەکوو: ﴿ٱلنَّاسِ﴾ ﴿وَأَمَّا بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثۡ﴾ ﴿فِي ٱلۡيَمِّ﴾ ﴿خُلِقَ مِن مَّآءٖ دَافِقٖ﴾ ﴿لَهُم مَّغۡفِرَةٞ﴾ ﴿وَمَن يَعۡمَلۡ﴾

٢- پلەی دووەم: (غوننە) لەگەڵ یاسای شاراوە (الاخفاء) و ئیقلاب، وەکوو: ﴿كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ﴾ ﴿تَرۡمِيهِم بِحِجَارَةٖ﴾ ﴿مِنۢ بَعۡدِ﴾

٣- پلەی سێیەم: (غوننە) لەگەڵ پیتەکانی (ن ، م)ی ساکن لە حاڵەتی (إظهار)دا، وەکوو: ﴿أَمۡ لم﴾ ﴿أَنۡعَمۡتَ﴾ ﴿مِنۡ هَادٖ﴾ ﴿مِنۡهُمۡ﴾

٤- پلەی لە گشتیان کەمتر: (غوننە) لەگەڵ پیتەکانی (ن، م)ە, ئەوانەی سەروژێریان هەیە (متحرك)، وەکوو: ﴿وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ ﴿وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾

**زانیاری**

پلەکانی (غوننە), ئەوانەی کە بە ئاسانی دەتوانین لە یەکتری جیا بکەینەوە, دوو پلەن:
١- غوننەی درێژ: (غوننە)ی لەگەڵ پیتە (مشدد)ەکان و(ئیدغام)و (ئیخفاء).
٢- غوننەی کورت: (غوننە)ی لەگەڵ دیارخستن(اظهار)و نون و میمەکانی جووڵاو(متحرك).

---

(١) هدایە القاری:(ص□□١-بڕتی١)

## یاساکانی لامی ساکن (احكام اللام الساكنة)

لامی ساکن( لْ ) لە قورئانی پیرۆزدا بە دوو شێوە هاتووە (ئ- لامی ڕەسەن ب- لامی نارەسەن).

ئ- (لامی ساکن)ی ڕەسەن: لەگەڵ کاری ڕابردوو هاتووە, وەکوو: ﴿جَعَلْنَا﴾﴿وَظَلَّلْنَا﴾ لەگەڵ کاری ڕانەبردوو هاتووە, وەکوو: ﴿وَلَا يَلْتَفِتْ﴾﴿يجْعَلْ﴾ لەگەڵ کاری داخوازیی هاتووە, وەکوو: ﴿ثُمَّ لْيَقْضُواْ﴾ ﴿ٱجْعَلْ﴾ لەگەڵ ناوەکان هاتووە, وەکوو: ﴿ٱلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ﴾, تەنیا لەگەڵ ئەم دوو پیتەش هاتووە: ﴿هَلْ ، بَلْ﴾.

ئەگەر (لامی ساکن)ی ڕەسەن, لە ناوەڕاستی وشەدا بێت و ئەو وشەیە کار بێت یان ناو بێت(فعل أواسم), هەموو کاتێك بە (إظهار)دەخوێندرێتەوە، وەکوو:
﴿وَجَعَلْنَا﴾ ﴿أَرْسَلْنَا﴾ ﴿وَأَلْوَٰنِكُمْ﴾ ﴿يَلْتَقِطْهُ﴾ ﴿أَلْسِنَتِكُمْ﴾ ﴿ٱلْتَقَتَا﴾

ئەگەر (لامی ساکن) لە کۆتایی وشەدا بێت, جا کار(فعل), یان پیت (حرف) بێت، بەم دوو شێوەیە دەخوێندرێتەوە:

ئ- تێکهەڵکێشان (الإدغام): ئەگەر دوای لامی ساکن (لْ) یەکێك لە پیتەکانی (ل، ر) لە وشەی دواتردا هاتبێت، لەوکاتەدا لامی ساکن بە دەرچە و سیفەتەوە دەکەینە ناو پیتی(ل)یان پیتی(ر)دا، وەکوو:
﴿وَقُل رَّبِّ ٱغْفِرْ﴾﴿بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ﴾
﴿أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ﴾﴿هَل لَّكُم﴾

ب- ئاشکرا کردن (الإظهار): ئەگەر دوای لامی ساکن (لْ) هەر پیتێك هاتبێت جگە لە پیتی( ل ، ر ), لەوکاتەدا لامی ساکن بەئاشکرا (إظهار) دەخوێندرێتەوە، وەکوو:
﴿قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِمَ﴾ ﴿بَلْ تُؤْثِرُونَ﴾
﴿وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا﴾ ﴿هَلْ أَتَىٰكَ﴾

یێ- (لامی ساکن)ی نارەسەن: لە دەستپێکی ناوە ناسراوەکان هاتووە (الاسماءالمعرَّفة), کە پێی دەڵێن: لامی پێناسین (لام التعریف), ئەم لامە لە سەرەتای ناوەکانەوە, لە دوای هەمزەی گەیاندن، بۆ پێناسین و ناساندنی وشە زیاد دەکرێت, وەکوو:

( رَحمَة ⟵ ٱلرَّحمة )( جَبَل ⟵ ٱلجَبَل ) ( مَسۡجِد ⟵ ٱلمَسۡجِد )

بۆ زانین: هەندێك وشە بەبێ لامی پێناسین ناخوێندرێنەوە و ناشنووسرێن, واتە لەو وشانەدا ئەم لامە وەکوو لامی رەسەنی لێدێت، جا چ بە (إدغام) بخوێندرێنەوە یانیش بە(إظهار) وەکوو: ( ٱللَّه ، ٱلَّذِي ، ٱلَّتِي ، ٱلۡآن ، ٱلۡيَسَعَ ).

لامی پێناسین ( ٱل التعريف)ە, یەکێك لەم دوو ڕێگایانە دەخوێندرێتەوە:

- الإظهار
- الإدغام

بۆ خوێندنەوەی لامی پێناسین, بە (ئیدغام), یاخود بە(اظهار), لەسەر ئەو پیتە دەوەستێت کە دەکەوێتە دواى لام.

پیتە هیجائییەکان بەپێی لامی پێناسین, بۆ ئەم دوو جۆرە پیتە لێکجیا کراونەتەوە

- پیتە قەمەرییەکان (الحروف القمرية)
- پیتە شەمسییەکان (الحروف الشَّمسية)

پیتە قەمەرییەکان, ژمارەیان (١٤) پیتە:
( أ ، ب ، غ ، ح ، ج ، ك ، و ، خ ، ف ، ع ، ق ، ي ، م ، هـ )
لەم ڕستەیەدا کۆکراونەتەوە:
( إبغِ حَجَكَ وخَفْ عقيمَه ) (1)

پیتە شەمسییەکان, ژمارەیان (١٤) پیتە:
( ط ، ث ، ص ، ر ، ت ، ض ، ذ ، ن ، د ، س ، ظ ، ز ، ش ، ل )
لەم دێڕەشیعرەدا کۆکراونەتەوە:
طِبْ ثُمَّ صِلْ رَحِمًا تَفُزْ ضِفْ ذا نِعَمْ
دَعْ سُوءَ ظَنٍّ زُرْ شَريفًا لِلْكَرَمْ (2)

---

ح- ئاشكرا كردن (الاظهار): خوێندنەوەی پیتی لام (لام التعریف), بەشێوەیەكی ئاشكرا (إظهار), كاتێك دەكەوێتە پێش پیتێكی (قەمەری) یەوە, بە هۆی دووری نێوان دەرچەی لامەكە و دەرچەی پیتە قەمەرییەكان، بەم لامەش دەوترێت لامی قەمەری(اللام القمرية):

پیتەكانیشی ئەمانەن: (ء ، ب ، غ ، ح ، ج ، ك ، و ، خ ، ف ، ع ، ق ، ي ، م ، هـ) وەكوو:

﴿ ٱلۡقَمَرُ ﴾ ﴿ ٱلۡأَكۡبَر ﴾ ﴿ ٱلۡمِسۡكِينِ ﴾ ﴿ ٱلۡوَاقِعَةُ ﴾ ﴿ ٱلۡفَتۡحِ ﴾ ﴿ ٱلۡكِتَٰبَ ﴾

لامی (إظهار)ی قەمەری ( اللّام القمرية ) بەم ناوە ناونراوە:

بویە پیتی لام بەئاشكرا دەخوێندرێتەوە, وەك لامی وشەی (القمر)، ئەگەر (لام) وەك ئەستێرە دابنێین و ئەو پیتەش كە بەدوایدا دێت, وەك مانگ دابنێین, ئەستێرەكە لەگەڵ هەڵاتنی مانگ ون نابێت و لامیش وەك ئەستێرەكە لەگەڵ پیتی قەمەری ئاشكرا دەبێت.

خ- تێكهەڵكێشان (الإدغام): كاتێك پیتی لام (لام التعریف) دەكەوێتە پێش یەكێك لە پیتە (شەمسی)یەكان, ئەوكاتە پێویستە لام بەدەرچە و سیفەتەوە بۆ ناو پیتە شەمسییەكان ئیدغام بكەین, بە هۆی نزیكبوونی دەرچەی لام لە دەرچەی پیتە شەمسییەكانەوە, بەم لامەش دەڵێن: لامی شەمسی (اللّام الشمسية ).

پیتەكانیشی ئەمانەن:( ط، ث، ص، ر، ت، ض، ذ، ن، د ، س، ظ، ز، ش، ل ) وەكوو:

﴿ ٱلشَّمۡسَ ﴾ ﴿ ٱلثَّقَلَانِ ﴾ ﴿ ٱلطَّيۡرَ ﴾ ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنِ ﴾ ﴿ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ﴾ ﴿ ٱلنَّهَارِ ﴾

لامی (إدغام)ی شەمسی (اللّام الشّمسية) بەم ناوە ناونراوە:

ئەو لامەی لەگەڵ پیتە شەمسییەكان دێت, وەك لامی وشەی (الشّمس)لەگەڵ پیتی دوای خۆی تێكهەڵكێش دەبێت، چونكە پیتی لام, كە وەك ئەستێرەمان داناوە, هەر لەگەڵ خۆر هەڵاتن ون دبێت, بۆیە لامیش لەگەڵ پیتە شەمسییەكان دەبێتە ئیدغام و بەئاشكرا دەرناكەوێت.

## جیاوازیی نێوان لامی قەمەری و لامی شەمسی

| ژ | لامی شەمسی | لامی قەمەری |
|---|---|---|
| ١ | لامی شەمسی، یەکێك لە پیتە شەمسییەکان بەدوایدا هاتووە. | لامی قەمەری، یەکێك لە پیتە قەمەرییەکان بەدوایدا هاتووە. |
| ٢ | لامی شەمسی هیچ حـــەرەکەیەکی لەسەر نییە(ٱلْ). | لامی قەمەری سکونی لەسەرە (ٱلْ). |
| ٣ | پیتی دوای لامی شەمسی (پیتی شەمسی) شەددەی لەسەرە ( ٱلنَّهَار) | پیتی دوای لامی قەمەری (پیتی قەمری) شەددەی لەسەر نییە (ٱلْفَتْح) |
| ٤ | لامی شەمسی ناخوێندرێتەوە، چونکە لەگەڵ ئەو پیتەی کە بەدوایدا دێت ئیدغام دبێت ٱلنَّهَار ⟵ أَنَّهَارِ | لاما قەمەری دەخوێندرێتەوە، چونکە ئیدغام نابێت ٱلْفَتْحِ ⟵ أَلْفَتْح |

**زانیاری**

هەر وشەیەك لە قورئانی پیرۆزدا، بە (لام الامر)، هی ساکن دەستپێکردبێت، کە لەو وشەیەوە دەست بە خوێندنەوە دەکەین، لامەکە بە حەرەکە ڕەسەنەکەی دەخوێنینەوە، ئەویش کەسرەیە، وەکوو:

﴿ ثُمَّ لْيَقْطَعْ ﴾ (1) بە ﴿ لِيَقْطَعْ ﴾ دەخوێندرێتەوە

﴿ ثُمَّ لْيَقْضُواْ ﴾ (2) بە ﴿ لِيَقْضُواْ ﴾ دەخوێندرێتەوە

کاتێك لەسەر (ثُمَّ) دەوەستین

کاتی بەیەکگەیاندن، (لام الأمر) بە سکون دەخوێندرێتەوە، ئەگەر یەکێك لەم سێ پیتان لە پێشەوەی هاتبێت: (ثم ، و ، ف) وەکوو: ﴿ثُمَّ لْيَقْضُواْ , وَلْيَطَّوَّفُواْ , فَلْيَنظُرْ﴾

## ئیدغامی گەورە و ئیدغامی بچووك

١- **ئیدغامی گەورە (الإدغام الكبیر)**: ئەم جۆرە ئیدغامە لەو دوو پیتانەدا دروست دەبێت، كە هاوشێوەن، یان لە یەكەوە نزیكن، یاخود هاورەگەزن، بەڵام بەمەرجێك هەردوو پیتەكە بەسەروژێر (متحرك) بن[1]، هەروەك لە ڕیوایەتی (سوسی لە أبو عمرو)دا هاتووە، ئەم جۆرە ئیدغامە لە ڕیوایەتی ئیمام (حفص)یشدا، لە هەندێك وشەی قورئاندا هاتووە و بە ئیدغام نووسراونەتەوە، هەر بۆیە چۆن ئامادە كراون، ئاواش دەخوێندرێنەوە[2]، وەكوو:

| نووسینی وشە لە قورئاندا | لە بنچینەدا |
|---|---|
| ﴿إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓ﴾ (البقرة : ترييير)<br>﴿إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِيَ﴾ (النساء : تي له) | نِعمَ مَا<br>فنعمَ مَا |
| ﴿قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي فِي ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنِ﴾ (الانعام : برتي) | أتُحاجِجُونَنِي |
| ﴿أَمَّن لَّا يَهِدِّيٓ إِلَّآ أَن يُهْدَىٰ﴾ (يونس: لهسم) | لَّايَهْتَدِي |
| ﴿قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأْمَ۫نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ﴾ (يوسف : ترتر) | تَأمَنُنَا |
| ﴿قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ﴾ (الكهف : لهني) | مامَكَّنَنِي |
| ﴿قُلْ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ تَأْمُرُوٓنِّيٓ أَعْبُدُ أَيُّهَا ٱلْجَٰهِلُونَ﴾ (الزّمرشم) | تَأمُرونَنِي |

**زانیاری**

بۆیە پێی دڵێن ئیدغامی گەورە، چونكە بۆ خوێندنەوەی ئەو دوو پیتە بە ئیدغام، ئەو كارەی كە تێدا دەكرێت گەورەترە لە ئیدغامی بچووك، واتە پیتی یەكەمی (متحرك)، ساكن دەكەین، پاشان لەگەڵ ئەو پیتە تێكهەڵكێشی دەكەین، كە بەدوایدا دێت[3]، وەكوو:

﴿نُصِيبُ بِرَحْمَتِنَا﴾ ← ﴿نُصِيبِّرَحْمَتِنَا﴾

﴿رَسُولُ رَبِّكَ﴾ ← ﴿رَسُورَّبِّكَ﴾

---

(1) الأصول النيرات في القراءات:(صنيبرير-برتریر)
(2) حق التلاوة:(صبرشمیر)
(3) هداية القاري:(صرشمسمیر)؛ حق التلاوة:(صبرشمیر)

٢- **ئیدغامی بچووك (الإدغام الصغیر):** ئەم جۆرە ئیدغامە بەشێوەیەكی بەرچاو لە قورئاندا و لە گشت جۆرەكانی خوێندنەوەشدا هاتووە, ئەویش ئەگەر دوو پیتی هاوشێوە, یان لە یەكەوە نزیك, یاخود هاوڕەگەز, بەدوای یەكدا هاتبن و پیتی یەكەم ساكن بێت و پیتی دووەمیش بەسەروژێر (متحرك)بێت, پیتی ساكن لەگەڵ ئەو پیتە تێكهەڵكێش دەكرێت, كە بەدوایدا هاتووە[1] ، وەكوو:

| | | |
|---|---|---|
| وَمَن يَعۡمَلۡ | ⟵ | وَمَيَّعۡمَلۡ |
| وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ | ⟵ | وَمَلَّمۡ يَتُبۡ |
| وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ | ⟵ | وَلۡيَكۡتُبَّيۡنَكُمۡ |
| وَقُل رَّبِّ ٱغۡفِرۡ | ⟵ | وَقُرَّبِّ ٱغۡفِرۡ |

**بۆ زانین:** بۆیە پێی دڵێن ئیدغامی بچووك، چونكە كارەكی بچووكی تێدا دەكرێت, واتە پیتی یەكەم لە بنچینەدا ساكنە, بۆیە یەكسەر تێكهەڵكێشی ئەو پیتە دەكەین, كە بەدوایدا هاتووە[2].

پێویستە بزانین, كە ئیدغام لە ڕیوایەتی (حفص)دا, بەتەنیا ئیدغامی بچووكە, هەروەك لە بابەتەكانی ڕابردوودا شیكرایەوە.

---

(1) (یر) هدایة القاري:(صمسمیرشمسمیر)

## گەیەشتنی دوو پیتی زەننەدار(ساكن) (التقاء الساكنين)

لە زمانی عەرەبیدا, دروست نییە دوو پیتی ساكن بەدوای یەكدا بێن, بۆیە عەرەبەكان خۆیان لە سكونی یەكەم ڕزگار دەكرد، ئەم یاسایانە لەگەڵ قورئانیش بەكارهێنراون, جا چ لە كاتی دابەزینی قورئان لەلایەن پەروەردگارەوە, یاخود لەلایەن زانایانەوە لە كاتی نووسینی حەرەكەكان, یان لە كاتی خوێندنەوەدا نیشانیان كردبێت, بۆیە پێویستە بەپێی یاساكانی دوو ساكنەكە بخوێندرێنەوە.

دوو پیتی ساكن بە دوای یەكدا, بە دوو شێوە هاتوون:

- ١- لە یەك وشەدا
- ٢- لە دوو وشەدا

### ١- بەدوای یەكداهاتنی دوو پیتی زەننەدار (ساكن) لە وشەیەكدا:

لەم حاڵەتانەدا دروستە دوو پیتی زەننەدار (ساكن) بەدوای یەكدا بخوێندرێنەوە:

أ- ئەگەر پیتی ساكنی یەكەم پیتێكی نەبزوێنبێت, پیتی ساكنی دووەمیش سكونەكەی نارِەسەن بێت (سكونی وەستان), ئەوا بەم شێوەیە دروستە هەردوو پیتەكە بە سكون بخوێندرێنەوە, وەكوو:

﴿ وَٱلۡفَجۡرِ ١ وَلَيَالٍ عَشۡرٖ ﴾ ﴿ وَٱلۡفَتۡحُ ﴾ ﴿ رِجۡسٞ ﴾ ﴿ إِنَّهُۥ لَقَوۡلٞ فَصۡلٞ ﴾

ب- ئەگەر پیتی ساكنی یەكەم, یەكێك بێت لە پیتە مەددییەكان (ا ، و ، ی) یان پیتێكی نەرم (لین) بێت (و ، ی), هەروەها پیتی ساكنی دووەمیش, سكونێكی نارِەسەن بێت (سكونی وەستان), بەم شێوەیە دەبن بەدوو پیتی ساكن بەدوای یەكدا لە وشەیەكدا، پیتی مەددە (ساكنی یەكەم) بە (٢, ٤, ٦) حەرەكە درێژ دەكرێتەوە, كە دەبێتە (مد العارض) یاخود (مد اللّين)، ئەم جۆرە مەددە, هەردوو ساكنەكە لە یەكتری دوور دەخاتەوە, وەكوو:

| | |
|---|---|
| ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴾ | ساكنی یەكەم پیتی مەددەیە |
| ﴿ لِإِيلَٰفِ قُرَيۡشٍ ١ ﴾ | ساكنی یەكەم پیتی نەرمە(لین) |

ج- ئەگەر پیتی ساکنی یەکەم، پیتەکی (مەددە) بێت، یان پیتێکی (لین)بێت و پیتی ساکنی دووەمیش سکونەکەی ڕەسەن بێت، ئەوا پیتی ساکنی یەکەم بە شەش حەرەکە درێژ دەکەینەوە، کەپێ دەڵێن (المد اللّازم)، جا چ لە وشەکەدا بێت، یان لە خوێندنەوەی پیتەکەدا بێت، واتە مەددەدرێژەکە، هەردوو پیتە ساکنەکە لێکدوور دەخاتەوە، وەکوو:

﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ ﴿الحَآقَّة﴾ ﴿أَتُحَآجُّونِّي﴾
﴿ع ⟵ عَيْنْ﴾ ﴿الم ⟵ الف لَامْ مِّيمْ ﴾

بۆ زانین: لە هەندێك وشەدا، كاتێك لەسەر (مد اللّازم المثقل) دەوەستین، دەبن بە سێ پیتی ساکن بەدوای یەکدا، چونکە پیتی کۆتایی، لە دوو پیت پێکهاتووە، وەکوو: ﴿صَوَآفّ﴾ ﴿وَلَاجَآنّ﴾ هەروەها بەم شێوەیەش دروستە، چونکە بۆ وەستانە.

## ٢- بەدوای یەکداهاتنی دوو پیتی زەنەدار (ساکن) لە دوو وشەدا:

ئەگەر لە کۆتایی وشەیەکدا پیتێکی ساکن هاتبێت و ئەو وشەیەی کە بەدوایدا هاتووە، بە پیتێکی ساکن دەستپێکردبێت، واتە هەمزەی بەیەکگەیاندنی لە پێش بێت، ئەوا بە یەکێك لەم ڕێگایانە، خۆمان لە پیتی ساکنی یەکەم ڕزگار دەکەین:

تر- پیتی ساکنی یەکەم ناخوێندرێتەوە (حذف السّاكن الاول لفظًا).
یر- دانانی بۆر(ضمة) لەسەر پیتی ساکنی یەکەم (تحريك الساكن الاول بالضّمة).
سم- دانانی فەتحە لەسەر پیتی ساکنی یەکەم (تحريك الساكن الاول بالفتحة).
شم- دانانی کەسرە لە ژێر پیتی ساکنی یەکەم (تحريك الساكن الاول بالكسرة).

تر- حذف السّاكن الاول: ئەگەر دوو پیتی ساکن لە دوو وشەدا بەدوای یەکدا هاتبن، کۆتایی وشەی یەکەم پیتێکی مەددە بێت و سەرەتای وشەی دووەمیش پیتێکی ساکن بێت، پیتە مەددەکە ناخوێندرێتەوە، وەکوو:

﴿وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ بە ﴿وَقَالَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ دەخوێندرێتەوە
﴿وَإِذْ قَالُوا۟ ٱللَّهُمَّ﴾ بە ﴿وَإِذْ قَالُ ٱللَّهُمَّ﴾ دەخوێندرێتەوە
﴿أَفِي ٱللَّهِ شَكٌّ﴾ بە ﴿أَفِ ٱللَّهِ شَكٌّ﴾ دەخوێندرێتەوە

ێر– تحريك الساكن الاول بالضمّ: ئەگەر کۆتایی وشەی یەکەم, پیتی (میم)ی کۆ بێت, (میم الجمع), یان (واو)ی نەرم (لین) بێت, ئەو واوەی بۆ کۆ دەنووسرێت (واو اللّين الداله على الجمع), لەو کاتەدا پیتی (میم) و پیتی (واو) بە بۆر(ضمة)ە, دەخوێندرێنەوە، وەکوو:

﴿هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ ﴿لَهُمُ ٱبْعَثْ﴾ ﴿فَتَمَنَّوُاْ ٱلْمَوْتَ﴾ ﴿وَعَصَوُاْ ٱلرَّسُولَ﴾

**زانیاری**

میمی کۆ بەوە دەناسرێتەوە, ئەگەر یەکێك لەم چوار پیاتە لە پێشەوەی هاتبێت: ( هـ , ك , ت , ء ) بۆ زانین: بە تەنیا یەك وشە لە قورئاندا هاتووە, کە هەمزە کەوتبێتە پێش میمی کۆوە, ئەویش وشەی: (هَاؤُمُ)ە.

– تحريك الساكن الأول بالفتحة: پیتی ساکنی یەکەم لە دوو وشەدا, لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا بە فەتحە دەخوێندرێتەوە,

أ – ئەگەر دوای وشەی (مِنْ) لامی ساکن هاتبێت لە (ٱلْ)ی پێناسین (ال التعريف) ئەوا نونی ساکنی وشەی (مِنْ) بەفەتحە دەخوێندرێتەوە, وەکوو:

﴿مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ﴾ ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ ﴿مِنَ ٱلْكِتَٰبِ﴾

ب – کاتێك یەکەم ئایەت ﴿ الٓمٓ ﴾ لە سەرەتای سورەتی (آل عمران) لەگەڵ دووەم ئایەت پێکەوە دەخوێنینەوە, میمی ساکنی کۆتایی لە پیتی(میمْ ), بە فەتحە دەخوێندرێتەوە: بەم شێوەیە: ﴿الف لٓام میمَ ١ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ ٢﴾ .

بۆ زانین: سەرەتای (سورة آل عمران) بە یەکێك لەم سێ ڕێگایانە دەخوێندرێتەوە :

ێ- لێکجیاکردنەوە: بە سکون لەسەر ئایەتی یەکەم دەوەستین و مەددە لەگەل پیتی(لام) و (میم) بەشەش حەرەکە بەدرێژی دەخوێندرێتەوە، وەکوو:

﴿الف لٓام 6 میمْ 6 ١ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ ٢﴾

یڕ- بەیەکگەیاندنی هەردوو ئایەتەکە: میمی کۆتایی لە ئایەتی یەکەمدا بەفەتحە دەخوێندرێتەوە, مەددە لەگەڵ لام و میمییش بە شەش حەرەکە درێژ دەکەینەوە:

﴿الف لٓام میمٓ ١ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ٢﴾ 6 6

سم- بەیەکگەیاندنی هەردوو ئایەتەکە: درێژکردنی مەددی لام بە شەش حەرەکە و مەددی میم بە دوو حەرەکە, لەگەڵ خوێندنەوەی میم بەفەتحە:

﴿الف لٓام میمَ ١ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ٢﴾ 6 2

بۆ زانین: لە کاتی بەیەکگەیاندن, خوێنەر مەددی میمەکە بە شەش حەرەکە درێژ دەکاتەوە, چونکە حەرەکەی میمی کۆتایی لە بنچینەدا ساکنە، بەڵام کە خوێنەر مەددی میمەکە لە کاتی بەیەکگەیاندن بە دوو حەرەکە درێژ دەکاتەوە, لەبەر ئەوەیە پیتی میم فەتحەی وەرگرتووە, بۆیە وەکوو مەددی ئاسایی دەخوێندرێتەوە.

## شم- تحريك الساكن الاول بالكسرة:

أ – ئەگەر دوو پیتی ساکن لە دوو وشەدا بە دوای یەکدا هاتبن، بەڵام ساکنی یەکەم, پیتێکی نەبزوێن بێت (حرف صحيح), هەروەها هیچ کام لەو حاڵەتانەی کە گوتمان, لە فەتحە و زەمە و سڕینەوە نەگرێتەوە, ئەوا پیتی یەکەمی ساکن لەکاتی بەیەکگەیاندن, بە کەسرە دەخوێندرێتەوە, وەکوو:

﴿قُلِ ٱنتَظِرُوٓاْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ 158﴾

﴿أَفِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرۡتَابُوٓاْ﴾ ﴿لِّمَنِ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَۖ﴾

ب – ئەگەر ساکنی یەکەم واوی نەرم (لین) بێت، بەڵام هی کۆ نەبێت, یان یائی نەرم (لین) بێت, هەردوو پیتەکانی ( و ، ي ) بە کەسرە دەخوێندرێنەوە, وەکوو:

| | |
|---|---|
| ﴿ وَأَلَّوِ ٱسۡتَقَٰمُواْ ﴾ | ﴿ وَلَوِ ٱفۡتَدَىٰ بِهِۦٓ ﴾ |
| ﴿ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ﴾ | ﴿ بَيۡنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ ﴾ |

ج – ئەگەر ساکنی یەکەم نونی تەنوین بێت (دوو فەتحە یان دوو (ضمَة), یاخود دوو کەسرە)بن, ئەوا نونی تەنوین لە کاتی بەیەکگەیاندن, بە کەسرە دەخوێندرێتەوە, وەکوو:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ﴿ وَرَهۡبَانِيَّةً ٱبۡتَدَعُوهَا ﴾ | بە | ﴿ وَرَهۡبَانِيَّتَنِ بۡتَدَعُوهَا ﴾ | دەخوێندرێتەوە |
| ﴿ بِغُلَٰمٍ ٱسۡمُهُۥ يَحۡيَىٰ ﴾ | بە | ﴿ بِغُلَٰمِنِ سۡمُهُۥ يَحۡيَىٰ ﴾ | دەخوێندرێتەوە |
| ﴿ وَأَمۡوَٰلٌ ٱقۡتَرَفۡتُمُوهَا ﴾ | بە | ﴿ وَأَمۡوَٰلُنِ قۡتَرَفۡتُمُوهَا ﴾ | دەخوێندرێتەوە |

**زانیاری**

خوێندنەوەی وشەی ﴿ ٱلۡٱسۡمُ ﴾

ئ- کاتی بەیەکگەیاندن, هەردوو هەمزەی گەیاندن ( ٱ ) ناخوێندرێنەوە و لامی ساکنیش, لەگەڵ سینی ساکن ( لۡسۡمُ ) دەمێنێتەوە, ئا لەوکاتەدا خۆمان لە ساکنی یەکەم (لۡ) ڕزگار دەکەین, بەخوێندنەوەی ساکن بە کەسرە، بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە: (بِئۡسَ لِسۡمُ الفُسُوقُ)

ب- ئەگەر لە وشەی ﴿ ٱلۡٱسۡمُ ﴾وە دەست بەخوێندنەوە بکەین, بەم دوو ڕێگایە دەخوێندرێتەوە[1]: ﴿ أَلِسۡمُ الفُسُوق ﴾ یان ﴿ لِسۡمُ الفُسُوق ﴾

---

[1] أحكام قراءة القرآن:(ص لهيرسم)

## ﴿ یاءات الاضافة ویاءات الزوائد ﴾

ج- یائی زیادکراو (یاء الإضافة) (ي): یائێكی زیادە لە بنیاتی وشەكە كە پێی دەڵێن: (یاء المتكلم), بۆ ناو و كار و پیتەكان زیاد دەكرێت، زانایانی قیرائەتەكان كۆك نین لەسەر حەرەكەكەی لە كاتی بەیەكگەیاندن دا, ئاخۆ پیتێكی ساكنە, یان پیتێكی بە فەتحەیە.

**زانیاری**

(یاء المتكلم) بەوە دەناسرێتەوە, كە لە وشەیەكدا دەسڕێتەوە و پیتی ( كاف ) یان پیتی (هاء) دەخرێتە شوێنی و مانای ئەو وشەیە تێك نەچێت، وەكوو:

﴿ ضیفي ← ضَیفكَ ← ضَیفهُ ﴾ ﴿ مَسَّنِـي ← مَسَّكَ ← مَسَّهُ ﴾

أ-خوێندنەوەی بە سكون: زۆربەی زانایانی قیرائەتەكان دەڵێن: پیتی (یاء المتكلم) لەبنچینەدا پیتێكی ساكنە و پێویستە بە سكون بخوێندرێتەوە، لە ڕیوایەتی ئیمام (حفص)دا هەندێك جار بە سكون و هەندێك جاریش بە فەتحە دەخوێندرێتەوە، بەڵام ئەگەر ساكن بێت و (همزە الوصل) بەدوایدا هاتبێت, واتە پیتێكی ساكن بەدوایدا هاتبێت, ئەوا بە سڕینەوە، خۆمان لە سكونەكەی ڕزگار دەكەین, وەكوو:

﴿ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ ﴾ ﴿ مِنۢ بَعۡدِي ٱسۡمُهُۥٓ أَحۡمَدُۖ ﴾ ﴿ قَوۡمِي ٱتَّخَذُواْ ﴾

ئەگەر(ی) ساكن بێت و پیتێكی (متحرك)بەدوایدا بێت, بە مەددە دەخوێندرێتەوە، وەكوو:

﴿وَإِنِّي عُذۡتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم﴾ ﴿أَنزِلۡنِي مُنزَلٗا ﴾ ﴿لَوۡلَآ أَخَّرۡتَنِيٓ إِلَىٰٓ﴾

ب- خوێندنەوەی بەفەتحە: زۆرێك لە زانایانی قیرائەتەكان دەڵێن: پیتی (ي)(یاء المتكلم) لەبنچینەدا پیتێكی بەفەتحەیە و هەمیشەش بەفەتحە دەخوێندرێتەوە، لە ڕیوایەتی (حفص)یشدا لە سێ حاڵەتدا, هەمیشە (یاء المتكلم)بەفەتحە دەخوێندرێتەوە:

ج- ئەگەر لە وشەیەكدا, ئەلیف لە پێشەوەی هاتبێت، ، وەكوو:

﴿ وَمَحۡيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ﴾ ﴿ وَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ﴾ ﴿هُدَايَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ ﴾

یر- ئەگەر یائێکی ساکن لە هەمان وشەدا لە پێشەوەی هاتبیت, ئەوا لەگەڵ ئەو یائە ئیدغام دەبێت و دەبێتە یائێکی بەشەددە، وەکوو:

﴿ بِيَدَيَّ ٱسۡتَكۡبَرۡتَ ﴾ ﴿ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ ﴾ ﴿بِمُصۡرِخِيَّ إِنِّي﴾ ﴿وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ﴾

سم- ئەگەر لامی پێناسینی ساکن بەدوایدا هاتبێت لە وشەی دواتردا، وەکوو:

﴿نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ ﴾ ﴿جَآءَنِيَ ٱلۡبَيِّنَٰتُ ﴾ ﴿وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ ﴾

بۆ زانین: (یاء المتکلم) لەلای ئیمام (حفص), بەتەنیا لە یەك ئایەتدا لە پێش (ٱلۡ) بە سکون دەخوێندرێتەوە نەك بەفەتحە, پاشان بە هۆی بەیەکگەیشتنی دوو پیتی زەنەدار(التقاء الساكنين) پیتی (یاء) نامێنێت، ئەویش ئەم ئایەتەیە لە (سورة البقرة)دا: ﴿قَالَ لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ١٢٤﴾ بە ﴿قَالَ لَا يَنَالُ عَهۡدِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ دەخوێندرێتەوە

جگە لەو خاڵانەی دیاریمان کردوون, ئەو وشانەی کە ماون, ئیمام (حفص), لە هەندێك شوێن فەتحە و لە هەندێك شوێنیش سکونی بۆ (یاء المتکلم) هەڵبژاردووە، وەکوو:

| | |
|---|---|
| خوێندنەوەی یاء بەفەتحە | ﴿ مَعِيَ أَبَدٗا ﴾ ﴿إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ﴾ ﴿وَطَهِّرۡ بَيۡتِيَ لِلطَّآئِفِينَ ﴾ |
| خوێندنەوەی یاء بەسکون | ﴿وَإِنِّي عُذۡتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُمۡ﴾ ﴿أَنزِلۡنِي مُنزَلٗا ﴾ ﴿لَوۡلَآ أَخَّرۡتَنِيٓ إِلَىٰٓ﴾ |

یر- یائە زیادەکان (یائات الزوائد): یائی زیادە یان ڕەسەنن لەبنیاتی وشەکە, لەکوتایی ناو و کارەکان دێن, بەڵام لە ڕەسمی قورئاندا نە نوسراون, هەندێ زانای قیرائەتەکان دەیخوێننەوە و هەندێکیش نایخوێننەوە، بەڵام لە ڕیوایەتی ئیمام (حفص)دا نەنووسراون و ناشخوێندرێنەوە, واتە بەپێی وێنەی وشەکە دەخوێنینەوە, وەکوو:

﴿ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِ﴾ ﴿يَوۡمَ يُنَادِ ٱلۡمُنَادِ﴾ ﴿ يَوۡمَ يَدۡعُ ٱلدَّاعِ ﴾ ﴿فَهُوَ يَهۡدِينِ ﴾ ﴿ فَٱعۡتَزِلُونِ ﴾

لە ڕیوایەتی ئیمام (حفص)دا, بەتەنیا یائی وشەی ﴿فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ﴾ بەفەتحە دەخوێندرێتەوە, لە کاتی بەیەکگەیاندن: ﴿فَمَآ ءَاتَىٰنِيَ ٱللَّهُ﴾، بەڵام لە کاتی وەستان, بە دوو شێوە دەخوێندرێتەوە: (فَمَا آتَانِي ) یان (فَمَا آتَانْ)

# بەشی پێنجەم

- دریژکردنەوە و کورتکردنەوە ( المد والقصر )
  - ( المد الطبيعي )
  - ( مد العوض )
  - ( مد البدل و شبيه البدل )
  - ( مد الصّلة )
  - ( مد التّمكين )
  - ( المد اللازم )
  - ( المد الواجب المتصل )
  - ( المد الجائز المنفصل )
  - ( المد العارض للسكون )
  - ( مد اللين )
- یاساكانی خوێندنەوەی دوو درێژكراو( مەددە ) پێكەوە ( قاعدة أقوى السببين )

تەجویدی شایان

بۆ فێربوني قورئان

## درێژكردنەوە و كورتكردنەوە ( المـد والقصر )

**(المد): درێژكردنەوە** (1)

هەندێك پیت لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون, پێیان دەڵێن پیتی نەرم و پیتی درێژكردن, (المد واللین) یان پیتە لێككێشاوەكان (المط) ئەوانیش بریتین لەم سێ پیتانە: (ا ، و ، ي), ئەم پیتانە لەبنچینەدا بە دوو حەرەكە درێژ دەكرێنەوە, ئەگەرنا بە دروستی ناخوێندرێنەوە, كە پێیان دەڵێن كورتكردنەوە (القصر), وە هەندێك جاریش درێژتر دەخوێندرێنەوە, ئەویش بەپێی هۆكاری درێژكردنەكەی.

پیتە مەددەكان (ا ، و ، ي)یان بە بچووكی نووسراون بەم شێوەیە: ( ◌ٰ ، ◌ۥ ، ◌ۦ ) بەڵام دەبێ پێش ئەم پیتانە, حەرەكەیان لە ڕەگەزی خۆیان بێت:

ألف (ا): پێش ئەو (فەتحە) بێت، وەكوو: قَال
واو (و): پێش ئەو (ضمَة) بێت، وەكوو: يقُول
ياء (ي): پێش ئەو (كەسرە) بێت، وەكوو: قِيل

**نموونة**

﴿ أَضَآءَتۡ ﴾ ﴿ قَالُوٓاْ ﴾ ﴿ بَرِيٓءٌ ﴾ پیتە گەورەكانی مەددە

﴿ إِبۡرَٰهِمَ ﴾ ﴿ دَاوُۥدُ ﴾ ﴿أَيَحۡسَبُ أَن لَّمۡ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ ﴾ پیتە بچووكەكانی مەددە

### مەرجی پەیدابوونی مەدد:

هەبوونی پیتێكی مەددە (ا ، و، ي), پێش ئەوانیش, حەرەكەیەك لە ڕەگەزی خۆیان بێت و پێش هەردوو پیتی نەرم ( و ، ي)یش فەتحە بێت.

### ئەگەرەكانی درێژكردنەوەی پیتی مەدد:

ىر- پێش پیتی مەددە, یان دواى پیتی مەددە هەمزە بێت(2)، وەكوو: (ءامَنُوا ، يَشَاء).

ىر- دواى پیتی مەددە, پیتێكی ساكن بێت(3)، وەكوو: (الحاقَّة ، ءَآلۡئَٰنَ ، يَعمَلُون).

---

(1) المعجم الوسيط:(ىر/ص ىرىتي) (2) (ىر) الملخص المفيد في علم التجويد:(صرشمشم)

## جۆرەکانی مەددە

**يز- مەددی بنەڕەت (المد الاصلي):**
درێژکردنەوەی پیتی مەددە بە دوو حەرەکە, بەبێ هیچ هۆکارێك, پێی دەڵێن مەددی ئاسایی(المد الطبيعي)

**يز- مەددی لاوەکی (المد الفرعي):**
درێژکردنەوەی پیتی مەددە لە دوو حەرەکە زیاتر, ئەگەر دوای ئەو, هەمزە یان پیتێکی ساکن بێت.



تز- نیشانەی مەددی ئاسایی لە قورئانی پیرۆزدا, بە تەنیا هەبوونی پیتێکی مەددەی بێ حەرەکەیە, پیتی پێش خۆیشی, حەرەکەیەکی لەسەرە لە ڕەگەزی خۆی.
يز- نیشانەی مەددی لاوەکی لە قورئانی پیرۆزدا, پیتی مەددە, نیشانەی مەددەی لەسەرە (~) کە لە وشەی(مد) دروست کراوە و بەم شێوەیە:
( مد ← مد ← ~ )
پیتی پێش مەددەش, حەرەکەکەی لە ڕەگەزی پیتی مەددەکەیە

**زانیاری**

پێوەری درێژکردنی دەنگی مەددە پێی دەڵێن **حەرەکە**.
**حەرەکە:** بە ئەندازەی خوێندنەوەی پیتێکی بە سەروژێر هەژمار دەکرێت، وەکوو:

| | |
|---|---|
| يز حەرەکە = بَ بَ | یان بە ئەندازەی ئەلیفێك |
| شم حەرەکە = بَ بَ بَ بَ | یان بە ئەندازەی دوو ئەلیف |
| حەرەکە = بَ بَ بَ بَ بَ بَ | یان بە ئەندازەی سێ ئەلیف |

یاخود حەرەکەکان بە کردنەوە یان بە داخستنی پەنجەکان هەژمار دەکرێت[1] بەڵام بۆ کەسانی ئاسایی, واتە ئەو کەسە بەتەمەن نەبێت, ئەوەی کە جووڵەی لاواز بێت.

---

(1) الملخص المفيد:(صتزشم)

## ـ‌ًّ‌ - مەددی ئاسایی

**مەددی ئاسایی:** كاتی پیتی مەددە بەپێی پێوەری ئاسایی خۆی درێژ دەكرێتەوە, كە دوو حەرەكەیە، دوو جۆرە مەددی ئاسایی هەن:

**ـ‌ًّ‌- مەددی ئاسایی لە وشەدا:** ئەگەر پیتی مەددە لە ناوەڕاستی وشەكە یان كۆتایی وشەكەدا بێت و دوای ئەوە, هیچ پیتێكی ساكن یان هەمزە نەهاتبێت.

**نموونة**

﴿نُوحِيهَــا﴾ ﴿وَأُوتِينَــا﴾ ﴿ٱلۡعَٰلَمِــينَ﴾ ﴿يُوصَــلَ﴾ ﴿وَٱشۡــرَبُوا۟﴾ ﴿وَٱلنَّصَٰرَىٰ﴾

**یـ- مەددی ئاسایی لە پیتدا :** پێنج پیت لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون, بە دوو پیت دەخوێندرێنەوە و پیتی دووەم پیتی مەددەیە, دوو حەرەكە درێژ دەكرێتەوە, ئەو پیتانەش بریتین لەمانە:

( ح ، ي ، ط ، هـ ، ر) (حي طهر) بە (حا ، يا ، طا ، ها ، را) دەخوێندرێنەوە.

**نموونة**

﴿حمٓ﴾ ⟵ ﴿حا ميم﴾ ، ﴿كٓهيعٓصٓ﴾ ⟵ ﴿كاف ها يا عين صاد﴾

﴿طه﴾ ⟵ ﴿طا ها﴾ ، ﴿الٓرٰ﴾ ⟵ ﴿الف لام را﴾

| جۆرەكانی مەددە, ئەوانەی وەك مەددی ئاسایی درێژ دەكرێنەوە | جۆرەكانی مەددە, ئەوانەی بە هۆی (هەمزە یان سكون)ەوە زیاتر لە دوو حەرەكە درێژ دەكرێنەوە | |
|---|---|---|
| مەددە لە وشەیەكدا | مەددە لە پیتێكدا | مەددە لە وشەیەكدا |
| ـ‌ًّ‌– مد العوض<br>یـ– مد البدل وشبيه البدل<br>– مد الصّلة الصغرى<br>شه– مد التمكين | ( المد اللّازم الحرفي) لەگەڵ پیتەكانی ( ن ، ق ، ص ، ع ، س ، ل ، ك ، م) ئەم پیتانە لەم ڕستەیەدا كۆدەبنەوە: (سَنقُصُ عِلمَك) | ـ‌ًّ‌- المد اللّازم الكلمي<br>یـ– المد الواجب المتصل<br>– المد الجائز المنفصل<br>شه– مد الصّلةالكبرى<br>له– المد العارض للسّكون<br>– مد اللين |

**یـ- مـەددی لـەجیاتی تـەنوین (مد العوض):** ئـەم جـۆرە مەددەیـە لـە وشـەیەکدا دەخوێندرێتەوە, کاتێك لەسەری دەوەستین و پیتی کۆتایی دوو فەتحەی لەسەر بێت, ئەوا هەردوو فەتحەکە دەگۆڕدرێن بۆ پیتی ئەلیف[1] .

ئەم جۆرە مەددەیە بە ئەندازەی دوو حەرەکە درێژ دەکرێتەوە.

**نموونة** ﴿عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾ ﴿ مَآءً ثَجَّاجًا ﴾ ﴿ سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴾ ﴿ وَنِدَآءً ﴾

**تێبینی**

مەددی لەجیاتی تەنوین, لەگەڵ تائی داخراو( ـةً , ةً) ناخوێندرێتەوە, چونکە ئەم تائە لەکاتی وەستان, دەبێتە هائێکی ساکن (ـه , ه)، وەکوو:

﴿جَنَّةً ← جَنَّه ﴾ ﴿ مُؤمِنَةً ← مُؤمِنَه﴾ ﴿ شَجَرةً ← شَجَرَه ﴾

---

[1] ئەو وشانەی بە مەددی لەجیاتی تەنوین (مد العوض)دەخوێندرێنەوە, ئەلیف لە کۆتایەکەی نووسراوە, بەتەنیا ئەو وشانە نەبن, کە بە هەمزە کۆتاییيان هاتووە و پێش هەمزەش ئەلیف بێت, لەوکاتەدا ئەلیفی تەنوین نانووسرێت, چونکە لە کۆندا هەمزە هیچ وێنەیەکی نەبوو بۆ نووسینی ئەلیفی تەنوین, دوو ئەلیف بە دوای یەکتریدا دەهاتن, بۆیە دروستیش نییە دوو ئەلیف لە دوای یەکدا بنووسرێن، وەکوو: (نِدَاءً , مَاءً , بِنَاءً)

سم- مەددی گۆڕاو(مد البدل): ئەم جۆرە مەددەیە لە وشەیەكدا دەخوێندرێتەوە, ئەگەر هەمزە (ء) بكەوێتە سەرەتای وشەكەوە و پیتی مەددەش بەدوای هەمزەدا هاتبێت، ئەوا پیتی مەددە بە دوو حەرەكە درێژ دەكرێتەوە.

نموونة ﴿ ءَادَمَ ﴾ ﴿ ءَاتِنَا ﴾ ﴿ إِيمَٰنًا ﴾ ﴿ أُوتُواْ ﴾ ﴿ ءَاوَوا ﴾

بۆیە پێی دەڵێن مەددی گۆڕاو (مد البدل)، چونكە لەبنچینەدا ئەم وشانە بە دوو هەمزە دەستیان پێكردووە, هەمزەی دووەم ساكنە, دەگۆڕدرێت بۆ پیتێكی درێژكراو(مەددە) لە ڕەگەزی حەرەكەی هەمزەی یەكەم, چونكە لە زمانی عەرەبیدا, دوو هەمزە بە دوای یەكدا ناخوێندرێنەوە, ئەگەر هەمزەی دووەم ساكن بێت.

نموونة ﴿ ءَءْدم ﴾ ← ﴿ ءادم ﴾ ﴿ ءِءْمان ﴾ ← ﴿ إيمان ﴾ ﴿ ءُءْتوا ﴾ ← ﴿ أُوتوا ﴾

ئەگەر بە وشەیەك دەست بە خوێندنەوە بكرێت, كە بە(همزة الوصل) دەستپێكردبێت و هەمزەیەكی ساكن بەدوایدا هاتبێت, پێویستە خوێنەر هەمزەی دووەم بگۆڕێت بۆ پیتێكی مەددە سەر بە حەرەكەی هەمزەی یەكەم, دوای ئەوەی حەرەكەیەك بۆ(همزة الوصل)دادەنرێت و ئەمە دەبێتە درێژكراوی گۆڕاو(مد البدل) و بە دوو حەرەكە درێژ دەكرێتەوە، وەكوو:

﴿ فَلْيُؤَدِّ ٱلَّذِي ٱؤْتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ ﴾ (1) ← ( ٱؤْتُمِن ) بە ( أُوتُمِن ) دەخوێندرێتەوە

﴿ وَقَالُواْ يَصْلِحُ ٱئْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا ﴾ (2) ← (ٱئْتِنَا ) بە ( إِيتِنَا ) دەخوێندرێتەوە

﴿ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱئْتُونِي ﴾ (3) ← (ٱئْتُونِي) بە ( إِيتُونِي) دەخوێندرێتەوە

(1) سورة البقرة :سمتيير (2) سورة الاعراف :بيبي (3) سورة الاحقاف :شم

شم- مەددى نیمچە گۆڕاو (مد شبیه البدل): ئەم جۆرە مەددەیە ڕەسم و حوكمەكەی وەك مەددی گۆڕاو (مد البدل) وایە, بەڵام پیتی مەددەكە پیتێكی ڕەسەنە نەك گۆڕاو.

ئەم جۆرە مەددەیە بە ئەندازەی دوو حەرەكە درێژ دەخوێندرێتەوە.

**نموونة**

1- ﴿ أُوفِ﴾ ﴿ إِسْرَآءِيلَ﴾ ﴿ رَءُوفٌ ﴾ ﴿ شَنَآنُ ﴾ ئەم وشانە لە كاتی بەیەكگەیاندن, وەكوو درێژكراوی گۆڕاو (مد البدل) دەخوێندرێنەوە و كاتێك لەسەری دەوەستین دەبنە درێژكراوی تووشبوو بە سكون (مد العارض للسّكون).

2- ﴿ نَبِّئُونِي ﴾ ﴿ مَسْئُولًا ﴾ ﴿ وَلَا يَئُودُهُ ﴾ ئەم وشەیە لە كاتی بەیەكگەیاندن و وەستان, دەبنە درێژكراوی نیمچە گۆڕاو (مد شبیه البدل).

### جیاوازیی لە نێوان (مد البدل) و (مد شبیه البدل)

| ژ | مد البدل | مد شبیه البدل |
|---|---|---|
| 1 | پیتی مەددە لەبنچینەدا هەمزەیەكی ساكنە, یاخود بۆ پیتی مەددە گۆڕدراوە | پیتی مەددە لە هەمزەدا نەگۆڕاوە, واتە لە بناغەی وشەكەدایە |
| 2 | پیتی مەددە لە سەرەتای وشەكەدایە و پێش ئەویش هەمزەیە | پیتی مەددە لە سەرەتای وشە یان ناوەندی وشە یان كۆتایی وشەكەدایە و پێش ئەویش هەمزەیە. |

لهـ- مەددی گەیاندن (مد الصِّلَة): ئەم جۆرە مەددە لەگەڵ حەرەكەی پیتی (ـه، ه) دەخوێندرێتەوە, ئەو هائەی كە لە بناغەی وشەكە زیادە و بۆ كەسی سێیەمی ڕەگەزی نێر و نادیار, لە كۆتایی ناوەكان و كارەكان و پیتەكان زیاد دەكرێت (هاء الضمیر للمفرد المذكر الغائب).

### مەرجەكانی دروستبوونی مەددی گەیاندن (مد الصلة)

تر- هەبوونی هائی گەیاندن لە كۆتایی وشەدا ( هاء الضمیر للمفرد المذكر الغائب).

یر- پێویستە ئەم هائە, بۆر(ضمَة)ی لەسەر بێت, یان كەسرەی لەژێر بێت.

سم- پێویستە ئەم هائە لە نێوان دوو پیتی بەسەروژێر (متحرك)دا بێت.

## جۆرەکانی درێژکراوەی گەیاندن

| درێژکراوی گەیاندنی بچووک (مدّ الصِّلة الصُّغرى) | درێژکراوی گەیاندنی گەورە (مدّ الصِّلة الكبرى) |
| --- | --- |

أ- درێژکراوی گەیاندنی بچووک (مد الصلة الصغرى): درێژکردنی (ضمة)ەیە لەسەر (هاء), تا دەبێتە(واو), یاخود کەسرەی ژێر (هاء), تا دەبێتە یاء (دوو حەرەکە), کاتێك پیتی (ـه، ه)دەکەوێتە نێوان دوو پیتی (متحرك), بەمەرجێك دواى پیتی هاء, هەمزە نەهاتبێت.

نموونة

﴿إِنَّهُۥ عَلَىٰ رَجۡعِهِۦ لَقَادِرٞ﴾ ﴿بَلَىٰٓۚ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرٗا﴾

إنَّهو رجعهي ربَّهو بهي

ب- درێژکراوی گەیاندنی گەورە (مد الصّلة الكبرى): درێژکردنەوەی (ضمة)ە لەسەر هاء و کەسرەی ژێر هاء بە ئەندازەی (شم یان لە) حەرەکە, ئەگەر پێش هاء, پیتێکی بەسەرو ژێر بێت و دواى (هاء)یش هەمزەیەکی بەسەروژێر(متحرك) هەبێت.

نموونة

﴿أَيَحۡسَبُ أَن لَّمۡ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ﴾ ﴿كُلّٞ لَّهُۥٓ أَوَّابٞ﴾ ﴿بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ﴾

یرهو~ لَهو~ بهي~

تایبةتمةندي

به ریوایەتی (حفص), دوو وشە جیاواز دەخوێندرێنەوە :

تر- ﴿وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ٦٩﴾ (سورة الفرقان) لە نێوان (هاء الصلة) لە نێوان پیتێکی ساکن و پیتێکی بەسەروژێردا هاتووە, بەڵام کەسرەی(ها ء)ەکە درێژ دەکرێتەوە, تاکوو دەبێتە یاء[1] بەم شێوە: ﴿وَيَخۡلُدۡ فِيهِي مُهَانًا﴾

یر- ﴿وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ لَكُمۡۗ﴾ (سورة الزمر) هاء لە وشەی (يَرۡضَهُ), لە نێوان دوو پیتی بەسەروژێردا هاتووە, بەڵام (ضمة)ەکەی درێژ ناکرێتەوە.[2]

---

(1) (یر) هداية القاري:(صبر سم)؛ الملخص المفيد في علم التجويد:(صشه)

## ئەو حاڵەتانەی کە پیتی هاء, بە درێژکراوی گەیاندن(مد الصلة) ناخوێندرێتەوە

تر- بە ڕوایەتی ئیمام (حفص), لەم چوار وشەدا (1) حەرەكەی هاء درێژ ناكرێتەوە:

تر- ﴿أَرۡجِهۡ﴾ (الاعراف36 , الشّعراء 111 ) یر- ﴿فَأَلۡقِهۡ﴾ 28 ( النّمل)

سم- ﴿وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ﴾ 63 (الكهف ) 4- ﴿عَلَيۡهُ ٱللَّهَ﴾ 10 (الفتح )

یر- ئەگەر پیتی پێش هاء یان دوای هاء ساكن بێت، وەكوو:
﴿فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا﴾ ﴿مَّٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدٗا﴾

سم- ئەگەر هەردوو پیتی پێش و دوای هاء ساكن بوون، وەكوو: ﴿وَهَدَيۡنَٰهُ ٱلنَّجۡدَيۡنِ﴾.

شم- ئەگەر ( هاء )ەكە ڕەسەن بێت, (2) حەرەكەكەی درێژ ناكرێتەوە، وەكوو:
﴿كَلَّا لَئِن لَّمۡ يَنتَهِ لَنَسۡفَعَۢا بِٱلنَّاصِيَةِ﴾ ﴿مَا نَفۡقَهُ كَثِيرٗا﴾ ﴿فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٞ﴾

**زانیاری**

بەپێی وتەی زانایان، لە هائە ڕەسەنەكان, بەتەنیا هائی وشەی (هَٰذِهِ) درێژ دەكرێتەوە, وەكوو:﴿هَٰذِهِۦٓ أَنۡعَٰمٌ﴾﴿هَٰذِهِۦ بِضَٰعَتُنَا رُدَّتۡ إِلَيۡنَا﴾
هذهي~ هذهي

نیشانەی (مد الصلة الصّغری) لە قورئاندا واوێكی بچووك یان یائێكی سۆڕاو لە پشت هائەكەیە, نیشانەی(مد الصلة الكبری)ش, نیشانەی مەددە لەسەر واو و یائێكی بچووك هەیە.

---

( تر ) ﴿أَرۡجِهۡ وَأَخَاهُ﴾﴿فَأَلۡقِهۡ إِلَيۡهِمۡ﴾ لەم دوو وشەیەدا(هاء الصلة) بە سكون نووسراوە, كە پێویست بوو هائی كەسرەی لە
ژێر بوایە, بەڵام بەپێی نووسینی هەندێك بنەماڵەی عەرەب نووسراوە, كە (هاء الصلة) وەكوو پیتێكی ڕەسەنە و لە نێوان دوو پیتی بەسەروژێردا هاتووە, بەڵام لە كاتی بەیەكگەیاندن و وەستان بە سكون دەخوێندرێتەوە .

× ﴿وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ﴾ ﴿عَلَيۡهُ ٱللَّهَ﴾ پیتی هاء لەم دوو وشەیەدا بە بۆر (ضمة) نووسراوە, واتە لەسەر ڕەسەنایەتی خۆی, چونكە (هاء الصلة) لە بنچینەدا پێویستە بۆر (ضمة)ی لەسەر بێت, بەڵام ئەگەر كەسرە یان پیتی (یاء)ی لە پێشەوە هاتبێت بە كەسرە دەنووسرێتەوە.
× هۆكاری دووەم, بۆیە پیتی هاء لە وشەی(عَلَيۡهُ)بە بۆر(ضمة)نووسراوەتەوە, تاكوو وشەی (ٱللَّهَ) بەقەڵەوی بخوێندرێتەوە.

(یر) هائی ڕەسەن كاتێك دەناسرێتەوە, كە لە وشەدا دەسرێتەوە و ئەو وشەیەش كە دەمێنێتەوە, واتایەكەی بشێوێنرێت, لەوكاتەدا ئەو (هاء)ە, بە هائی ڕەسەن هەژمار دەكرێت, بەڵام ئەگەر دوای سڕینەوەی (هاء)ەكە, واتای ئەو وشەیە نەشێوێنرا, ئەو كاتە (هاء)ەكە, هائێكی ڕەسەن نییە, بەڵكوو لە (هاء الصلة)یە.

- مەددی شیاندن (مد التَّمكين)[1] : ئەم جۆرە مەددەیە لە وشەیەكدا دەخوێندرێتەوە, ئەگەر دوو (یاء) یان دوو (واو) بەدوایەكدا هاتبن و یەكێك لەو پیتانە, پیتی مەددە بێت, پێی دەڵێن مەددی شیاندن (مد التمكين)، چونكە پێویستە هێز بە پیتی مەددە ببەخشین بە درێژكردنەوەی, تاكوو ون نەبێت.

ئەم جۆرە مەددەیە بە ئەندازەی دوو حەرەكە درێژ دەكرێتەوە.
مەددی شیاندن (مد التّمكين) بە سێ جۆر لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە:

ئ- ئەگەر ( و ، ي )مەددە, پێش ( و ، ي ) بەسەروژێر هاتبن، وەكوو:
﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ﴿فِي يَوۡمَيۡنِ﴾

ب- ئەگەر واوێكی مەددە دوای واوێكی بۆر(ضمة), لەسەرەوە هاتبێت وەكوو: ﴿يَلۡوُۥنَ﴾
یاخود یائێكی مەددە دوای یائێكی كەسرە لەژێرەوە هاتبێت، وەكوو: ﴿يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ﴾

ج- ئەگەر یائی مەددە دوای یائێكی بەشەددە هاتبێت، وەكوو:
﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٖ﴾ ﴿مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾

---

[1] هەندێك زانا دەڵێن ئەم جۆرە مەددەیە لە پاشناوەكانی مەددە ئاسایییەكانن, بەڵام ئێمەش, وەك زۆرێك لە زانایان, لەم بابەتەدا شیمان كردۆتەوە, چونكە مەددێكی هەستیارە، لەبەرئەوەی دوو پیتی هاوشێوە دكەونە دوای یەكدی و یەكێكیان پیتی مەددەیە, تاكوو لێی ئاگادار بین و هیچ كامیان لەبیر نەكرێن.

- مەددی لازم (المد اللّازم)[1]: درێژکردنەوەی دەنگی پیتی مەددە بە شەش حەرەکە, ئەگەر پیتێکی ساکنی ڕەسەن لە دوای پیتی مەدد هاتبێت, جا چ لە خوێندنەوەی وشەیەك یان پیتێکدا بێت.

**جۆرەکانی مەددی لازم (المد اللاّزم)**

- ﭐ- مەددی لازم لە وشەیەکدا (المد اللازم الکلمي)
  - أ- مەددی لازمی قورس لە وشەدا (المد اللازم المثقل الکلمي)
  - ب- مەددی لازمی سووك لە وشەدا (المد اللازم المخفف الکلمي)
- ﺑ- مەددی لازم لە پیتێکدا (المد اللازم الحرفي)
  - أ- مەددی لازمی قورس لە پیتدا (المد اللازم المثقل الحرفي)
  - ب- مەددی لازمی سووك لە پیتدا (المد اللازم المخفف الحرفي )

**زانیاری**

دوو جۆرە سکون هەن, بۆ درێژکردنەوەی پیتی مەددە:

ﭐ- سکونی ڕەسەن (السکون الاصلي): ئەم جۆرە سکونە لەبنچینەدا لەسەر پیتەکەیە, وەکوو:

﴿ ءَآلْـَٰٔنَ ﴾ ﴿ فَلَا تَنْهَرْ ﴾

یا خود لە خوێندنەوەی پیتەکەدایە, وەکوو: ﴿ الٓمٓ ﴾ ⟵ لامْ ، ﴿ ص ﴾ ⟵ صادْ

ﺑ- سکونی کاتی (السکون العرضي): کاتێك لەسەر وشەیەك دەوەستین و لە بنچینەدا پیتی کوتایی بەسەر و ژێربێت, بەڵام چونکە ئێمە لەسەری وەستاوین, بۆیە دەبێتە ساکن, وەکوو:

﴿ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ ﴿ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴾ ﴿ تَذَكَّرُونَ ﴾ ﴿ ٱلنُّشُورُ ﴾

---

(ﭐ) بۆیە پێی دەڵێن (المد اللّازم)، چونکە لە گشت جۆرەکانی خوێندنەوە(القراءات العشر)دا, پێویستە بە شەش حەرەکە درێژ بکرێنەوە, واتە بە ئەندازەی سێ ئەلیف.

## ج- مەددی لازم لە وشەیەكدا( المد اللّازم الكلمي)

أ- مەددی لازم و قورس لە وشەدا (المد اللّازم المثقل الكلمي): درێژكردنەوەی دەنگی پیتی مەددە بە ئەندازەی شەش حەرەكە, ئەگەر دواى پیتی مەددە, پیتێكی گیرەدار (مشدد) لە هەمان وشەدا هاتبێت.

نموونة

﴿ءَآلذَّكَرَيۡنِ﴾ ﴿وَلَا تَتَّبِعَآنِّ﴾ ﴿ٱلۡحَآقَّةُ﴾ ﴿أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي﴾

ب- مەددی لازم و سووك لە وشەدا (المد اللّازم المخفف الكلمي): درێژكردنەوەی دەنگی پیتی مەددە لە وشەیەكدا بە ئەندازەی شەش حەرەكە, ئەگەر دوای پیتی مەددە, پیتێكی ساكن و سووك (بێ شەددە) لە هەمان وشەدا هاتبێت و سكونەكەی ڕەسەن بێت، نموونە:

بەتەنیا وشەی ﴿ءَآلۡـَٰٔنَ﴾ بەم جۆرە لەم دوو ئایەتەدا لە قورئاندا هاتووە

﴿أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ ءَامَنتُم بِهِۦٓۚ ءَآلۡـَٰٔنَ وَقَدۡ كُنتُم بِهِۦ تَسۡتَعۡجِلُونَ﴾ (1)
﴿ءَآلۡـَٰٔنَ وَقَدۡ عَصَيۡتَ قَبۡلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾ (2)

---

(1) (يبر) سورة يونس: ٥١ - ٥١

## مەدد لەگەڵ خوێندنەوەی پیتەکان

ئەو پیتانەی لە قورئانی پیرۆزدا بەتەنیا هاتوون, چواردە پیتن, لەم ڕستەیەدا کۆکراونەتەوە:
(نص حكيم قاطع له سر) (ن ، ص ، ح ، ک ، ي ، م ، ق ، ا ، ط ، ع ، ل ، هـ ، س)

### ئەو پیتانە و ناوەکانیشیان کە بەتەنیا لەقورئاندا هاتون ئەمانەن

| ن<br>نون | ص<br>صاد | ح<br>حا | ک<br>کاف | ي<br>یا | م<br>میم | ق<br>قاف |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ا<br>ألف | ط<br>طا | ع<br>عین | ل<br>لام | هـ<br>ها | س<br>سین | ر<br>را |

## ئەو پیتانەی لە مەددی ئاسایی درێژتر دەخوێندرێنەوە

1- ( س ، ن ، ق ، ص ، ل ، ک ، م ) (سنقص لكم): ناوی ئەم پیتانەیە, بە سێ پیت دەخوێندرێنەوە، پیتی ناوەند, پیتی مەددەیە و پیتی کۆتایی, پیتێکی ساکنی ڕەسەنە, پیتی ناوەندیش دەبێتە(مد اللاّزم)ی قورس یان سووك، بەم شێوەیە دەخوێندرێنەوە:

(سین ، نون ، قاف ، صاد ، لام ، کاف ، میم) بە شەش حەرەکە درێژ دەکرێنەوە.

2- ع ( عيْـنْ ): بە دوو جۆری مەددە دەخوێندرێنەوە:

أ- درێژکردنەوە بە چوار حەرەکە، چونکە دەبێتە(مد اللّين).
ب- درێژکردنەوە بە شەش حەرەکە، چونکە دەبێتە (مد اللازم).
باشتر وایە پیتی (عيْـنْ ) بە(مد اللازم)بخوێندرێتەوە, (شەش حەرەکە درێژ ببێتەوە).

هەر وەك ئیمامی (شاطبي) دەڵێت:

ومُــدَّ له عِندَ الفَواتِحِ مُشـبعًا ........ وفي عَينِ الوجهَانِ والطُولُ فُضِّلا

## یر- مەددی لازم لە پیتدا ( المد اللّازم الحرفي)

ئەم جۆرە مەددە لەو پیتانەدا دروست دەبێت, كە بەتەنیا لە سەرەتای هەندێك سورەتدا هاتوون و ناوەكەیان لە سێ پیت پێكهاتبێت و پیتی ناوەند, پیتێكی مەددی بێت، كە ژمارەیان هەشت پیتە, ئەوانیش ئەمانەن: (س ، ن ، ق ، ص ، ع ، ل، م ، ك ) لەم ڕستەیەشدا كۆكراونەتەوە: (سَنَقُصُ عِلمَكَ) (نَقَصَ عَسَلُكُم).

ئەم مەددانە بە دوو جۆر هاتوون:

أ- مەددی لازم و سووك لە پیتدا: (المد اللّازم المخفف الحرفي): ئەم جۆرە مەددە لەگەڵ ئەو پیتە دەخوێندرێتەوە, كە ناوەكەی لە سێ پیت پێكهاتبێت و پیتی ناوەند پیتێكی مەددە بێت و دوای ئەو, پیتێكی ساكنی سووكی (ئیدغام نەكراو) هاتبێت، پیتی مەدە بە ئەندازەی شەش حەرەكە درێژ دەكرێتەوە.

نموونة

| | | | |
|---|---|---|---|
| (قٓ) | بە | (قآف) | دەخوێندرێتەوە |
| ( الٓرۚ ) | بە | (الف لآم را) | دەخوێندرێتەوە |
| ( حٓم) | بە | (حا میم) | دەخوێندرێتەوە |

ب- مەددی لازم و قورس لە پیتدا: (المد اللَّازم المثقل الحرفي): ئەم جۆرە مەددە لە خوێندنەوەی ئەو جۆرە پیتەدا دروست دەبێت, كە بە سێ پیت دەخوێندرێتەوە و پیتی ناوەند, پیتێكی مەددی بێت و دوای پیتی مەددەش, دوو پیتی ئیدغامكراو هاتبن، ئەوا پیتە مەددەكە بە ئەندازەی (شەش) حەرەكە درێژ دەكرێتەوە.

نموونة

| | | | |
|---|---|---|---|
| ( الٓمٓ) | بە | (الف لآم مِّیم ) | دەخوێندرێتەوە |
| (الٓمٓر) | بە | (الف لآم میم را ) | دەخوێندرێتەوە |

**زانیاری**: ئەو مەددەی لەگەڵ پیتەكانی(ع) و (س)دا لە سەرەتای سورەتی (مريم ، الشورى) دروست دەبێت, كە بە(عينْ ، سينْ ) دەخوێندرێتەوە, لە كۆتایەكەیاندا نونی ساكن هاتووە و بەدوایدا پیتێكی (إخفاء)هاتووە, بۆیە غوننەیان پلەكەیان كاملە (غنَّة كاملة), بەم شێوەیەی خوارەوە:

كٓهيعٓصٓ ← بە (كَافْ هَا يَا عيٓنْ صَاد ) دەخوێندرێتەوە

حمٓ ١ عٓسٓقٓ ← بە (حَــا مِــيمْ عَــيٓنْ سِــيٓنْ قــاف) دەخوێندرێتەوە

## نموونە لەسەر مەددی سووك و قورس و ئاسایی لە پیتدا




**تی- مەددی پێویستی بەیەكگەیشتوو (المد الواجب المتَّصل)**[1] : ئەگەر پیتی (ء) بەدوای یەكێك لە پیتە مەددییەكان دا هاتبێت و هەردوو پیتی (هەمزە و پیتی مەددیش) لە یەك وشەدابن, پێویستە پیتی مەددە بە ئەندازەی(٤حركة یان ٥) حەرەكە درێژ بكرێتەوە, یاخود بە رێگای (الشاطبية و التيسير).

**نموونە** ﴿أَسَٰٓـُٔواْ ٱلسُّوٓأَىٰٓ﴾ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ ﴿سِيٓءَ بِهِمۡ﴾ ﴿أَشۡيَآءَهُمۡ﴾

---

(1) بۆیە پێی دەڵێن مەددی پێویست:(المد الواجب), چونكە پێویستە پیتی مەددە زیاتر لە كاتی ئاسایی خۆی, (دوو حەرەكە) درێژ بكرێتەوە. هەروەها بۆیە پێی دەڵێن: مەددی بەیەكگەیشتوو (المدالمتَّصل), چونكە پیتی مەدد و هەمزە پێكەوە لە یەك وشەدا هاتوون.

ی- مەددی ڕێپێدراوی پچڕاو (المد الجائز المنفصل) (1) : ئەم جۆرە مەددە لە نێوان دوو وشەدا دروست دەبێت, ئەگەر كۆتایی وشەی یەكەم پیتێكی مەددە بێت و سەرەتای ئەو وشەیەی بەدوایدا دێت هەمزە (ء) بێت, دەنگی پیتی مەددە بە ئەندازەی( شم ، لە ) حەرەكە درێژ دەكرێتەوە، ئەم جۆرە مەددە لە قورئانی پیرۆزدا بەم دوو شێوەیە نووسراوە:

أ - پیتی مەددە و هەمزە لە دوو وشەی جودادا نووسراون (2) ، وەكوو:

﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ﴾ ﴿ أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ ﴾ ﴿ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم ﴾ ﴿ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ ﴾

ب- پیتی مەددە و هەمزە لە یەك وشەدا نووسراون (3) , بەڵام لەبنچینەدا, ئەو دوو وشەیە لە یەكتری جیان، وەكوو:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ﴾ ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾ ﴿ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾ ﴿ يَٰٓأَبَتِ ٱفۡعَلۡ ﴾

**زانیاری**

پێویستە لە یەك دانیشتنی خوێندنەوەدا, مەددی شیاوی جودا ( مد الجائز المنفصل) و مەددی پێویستی بەیەكگەیشتوو(مدالواجب المتصل) بە یەك ئەندازە بە چوار حەرەكە, یاخود پێنج حەرەكە درێژ بكرێنەوە.

---

( ) بۆیە پێی دەڵێن مەددی ڕێپێدراو(مد الجائز), چونكە لە هەندێك جۆری خوێندنەوەدا, دروستە كە بە دوو حەرەكە درێژ بكرێتەوە, هەروەها بۆیە پێی دەڵێن: مەددی پچڕاو (المد المنفصل), چونكە ئەم جۆرە مەددەیە لە نێوان دوو وشەی جودادا دروست دەبێت.

(یر)( ) هدایە القاری:( ۃ/صسمتیر)

بر - مەددی تووشبوو بەسكون (المد العارض للسّكون): كاتێك ئەم جۆرە مەددەیە پەیدا دەبێت, كە بە سكون لەسەر وشەیەك بوەستین، بەڵام پیتی پێش كۆتایی, پیتێكی مەدد بێت, ئەوا ئەم وەستانە دەبێتە هۆی درێژكردنەوەی پیتی مەددەكە.
ئەم جۆرە مەددە, بە ئەندازەی ( یر یان شم یان ) حەرەكە درێژ دەكرێتەوە.

| نموونة | ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ﴿كُن فَيَكُونُ﴾ ﴿خَيۡرَٰتٌ حِسَانٞ﴾ |
|---|---|

تر - مەددی نەرم (مد اللِّين): ئەم جۆرە مەددە, لەگەڵ پیتەكانی( و ، ي ) دروست دەبێت, ئەگەر پێش ئەم دوو پیتە پیتێكی بەفەتحە بێت و دوای ئەوانیش پیتێكی بە سەرو ژێر بێت(متحرك), بەڵام بە سكون لەسەری بوەستین، ئەوكاتە هەردوو پیتی(و، ي) بە ئەندازەی ( یر ، شم ، ) حەرەكە درێژ دەكرێنەوە, دەشتوانین بەم جۆرەیە مەددە بڵێین: مەددی نەرمی تووشبوو بە سكون (مد اللِّين العارض للسّكون).

| نموونة | ﴿وَءَامَنَهُم مِّنۡ خَوۡفِۭ﴾ ﴿مِّن شَيۡءٖ﴾ ﴿بِيَدِكَ ٱلۡخَيۡرُۖ﴾ |
|---|---|

**پرسیار و وەڵام**

بۆچی پیتی ئەلیف ( ا ) بە پیتە مەددییە نەرمەكان (مد اللَّين) نەناسراوە؟
وەڵام:
تر- ئەلیف هەموو كاتێك پیتی مەددە, (ساكنە و پێش ئەو فەتحەیە)و لە بۆشایی دەردەچێت.
یر- هەندێك جۆری دیكەی مەدد پەیدا دەكات, كە لە مەددی نەرم (مد اللَّين) بەهێزترن, بۆیە بە مەددی نەرم (مد اللَّين) ناوزەد ناكرێت, بەڵام هەردوو پیتی (و، ی), حەرەكەی پێش ئەوان گۆڕانی بەسەردا هاتووە و لە ڕەگەزی خۆیان نییە, بۆیە مەددەكەشیان دەگۆڕدرێت و لاواز دەبێت.

## جۆری مەددەكان و پێوەری درێژكردنەوەيان

| ژ | جۆری مەددەكان | پێوەری درێژكردنەوە |
|---|---|---|
| 1 | المدّ الطبيعي (قَالَ) | ٢ حەرەكە |
| 2 | مدّ العوض (سِرَاجًا وَ هَّاجًا ) | ٢حەرەكە |
| 3 | مدّ البدل و شبيه البدل (ءَامَنُوا ، إِسۡرَٰٓءِيلَ) | ٢ حەرەكە |
| 4 | مدّ الصّلة الصغرى ( إِنَّهُۥ عَلَىٰ )(بِهِۦ بَصِيرٗا) | ٢ حەرەكە |
| 5 | مدّ التمكين (ٱلنَّبِيِّـۧنَ ، يَلۡوُۥنَ ) | ٢ حەرەكە |
| 6 | ئەو مەددەی لەگەڵ پيتەكانی(حي طهر), دێت, وەك: (طه) | ٢ حەرەكە |
| 7 | المدّ اللازم الكلمي والحرفي (المثقّل والمخفّف)( الٓمٓ ، الحاقَّة ) | ٦ حەرەكە |
| 8 | المدّ الواجب المتصل (أُوْلَٰٓئِكَ) | (شە ، لە ) حەرەكە |
| 9 | المدّ الجائزالمنفصل(يَٰٓـَٔادَمُ) ومد الصّلة الكبرى ( لَّهُۥٓ أَوَّابٌ) | (شە ، لە ) حەرەكە |
| 10 | المدّ العارض للسّكون( نَسۡتَعِينُ ) ومدّ اللين (خَوۡفٍۭ ) | ( ٢،شە، ٦ حەرەكە) |

تاقيكردنةوة

ئەم ئايەتە زۆرترين جۆری مەددەی تێدا هاتووە

﴿وَحَآجَّهُۥ قَوۡمُهُۥۚ قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي فِي ٱللَّهِ وَقَدۡ هَدَىٰنِۚ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشۡرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّي شَيۡـٔٗاۚ وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۚ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ٨٠﴾ (سورة الانعام)

## ﴿ چەند هەڵەیەك لەگەڵ خوێندنەوەی پیتە (مەدییەكان) ﴾

تر- درێژكردنەوە یان كورتكردنەوەی دەنگی گشت جۆرەكانی مەددە, نە لەكاتی دروستی خۆیان, وەكوو: ﴿ صُحُفِ إبرااااهِيمَ وَمُوسى اااااا ﴾

هەندێك جار ئەم هەڵەیانە دەبنە هۆی شێواندنی واتای ئایەتەكە و دەبێتە هەڵەیەكی حەرام (لحن جلی)، وەكوو:

﴿ فَسَقَىٰ لَهُمَا ﴾ ⟵ ﴿ فَسَق لَهُمَا ﴾
﴿ قَالَا رَبَّنَا ﴾ ⟵ ﴿ قَال رَبَّنا ﴾
﴿ تَلُومُونِي ﴾ ⟵ ﴿ تَلُمُنِي ﴾
﴿ وَلَا تَمُوتُنَّ ﴾ ⟵ ﴿ وَلَتَمُوتُنَّ ﴾

سم- خوێندنەوەی هەمزە لەگەڵ مەددی كۆتایی وشە، وەكوو:

﴿ غَفُورًا ﴾ ⟵ ﴿ غفوراء ﴾ ﴿ تَعدِلُوا ﴾ ⟵ ﴿ تعدِلُواء ﴾ ﴿ رَقِيبًا ﴾ ⟵ ﴿ رَقِيباء ﴾ ﴿ عِتِيًّا ﴾ ⟵ ﴿ عِتِيّاء ﴾

شم- دەرهێنانی هەندێك لە دەنگی مەددە لە لووت, بەتایبەتی ئەگەر پێش پیتی مەددە, یەكێك لە پیتەكانی (م ، ن) هاتبێت، چونكە دەبێتە مەددی بەغوننە، وەكوو:

﴿ ٱلرَّحْمَٰنِ , ٱلنَّاسِ , يُعَلِّمُونَ ﴾

لە- لەراندنی پیتی مەدد, كە ببێتە هۆی دووبارەكردنەوەی پیتەكە, بەمەبەستی دەنگ خۆشكردن.

- ئاوێتەكردنی دەنگی ئەلیف لەگەڵ دەنگی یاء, كە دەبێتە هۆی لاربوونەوە (ئیمالە).

## جیاوازیی لە نێوان پیتە مەددییەکان (ا ، و ، ي) و پیتە نەرمەکان (اللّين) (و، ي)

| ژ | پیتە مەددییەکان ( حروف المد ) | پیتە نەرمەکان ( حروف اللّين ) |
|---|---|---|
| ١ | پیتە مەددییەکان بریتین لەم سێ پیتانە: (ا ، و ، ى) | پیتە نەرمەکان (اللّين)، بریتین لەم دوو پیتانە: ( و ، ى ) |
| ٢ | دەرچەیان دەستنیشان نەکراوە و لە بۆشایی دەم و گەروو دەردەچن. | دەرچەیان دەستنیشان کراوە و (واو) لە لێوەکان دەردەچێت و (یاء)یش لە ناوەڕاستی زمان. |
| ٣ | درێژ دەخوێندرێنەوە، جا چ لە کاتی وەستان بێت یاخود کاتی بەیەکگەیاندن بێت، وەکوو: ﴿قَالَ﴾ ﴿الرَّحِيمِ﴾ ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ ﴿ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ | لەکاتی وەستان لە وشەدا درێژ دەکرێنەوە، وەکوو: ﴿خَوْفٍ﴾ ﴿شَيْءٍ﴾، لە پیتیشدا، لە وەستان و بەیەکگەیاندندا، وەکوو: پیتی (ع) لە سورەتی: (الشُّورى و مريم) ﴿حمٓ ١ عٓسٓقٓ﴾ ﴿كٓهيعٓصٓ﴾ |
| ٤ | هەموو کاتێك ساکنن و هیچ حەرەکەیەکیان لەسەر نییە و پێش ئەوانیش، حەرەکەیەکی لەسەرە لە ڕەگەزی پیتەکە خۆی، وەکوو: ﴿ ٱلرَّسُولَ ﴾ ﴿ السَّمَاء ﴾ ﴿ ٱلرَّحِيمِ ﴾ | ساکنن و نیشانەی سکونیان ( ْ )ی لەسەرە و پێش ئەوانیش، پیتەکە فەتحەی لەسەرە، وەکوو: ﴿قُرَيْشٍ﴾ ﴿ٱلْيَوْمَ﴾ |
| ٥ | ئەگەر پیتێکی ساکن لە وشەی دواتردا هاتبێت، ئەوا دەسڕێنەوە، وەکوو: ﴿أَفِي ٱللَّهِ شَكٌّ﴾ ﴿وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ بەڵام ئەگەر لە هەمان وشەدا، پێش پیتێکی ساکن هاتبن، ئەوا درێژ دەکرێنەوە، وەکوو: ﴿ءَآلْـَٔنَ﴾ ﴿الحَاقَّةُ﴾ | ئەگەر دوای پیتی نەرم(اللّين)، پیتێکی ساکن هاتبێت، پیتی نەرمەکە (اللّين) بە کەسرە دەخوێندرێتەوە، وەکوو: ﴿وَأَلَّوِ ٱسْتَقَٰمُوا۟﴾ ﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجْنِ﴾ یاخود بە(ضمة) دەخوێندرێتەوە، وەکوو: ﴿وَعَصَوُا۟ ٱلرَّسُولَ﴾ |
| ٦ | پیتە مەددییەکان لەگەڵ پیتە هاوشێوەکانی خۆیان ئیدغام نابن، وەکوو: ﴿ وَإِن تُصْلِحُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ ﴾ ﴿ فِي يَوْمٍ ﴾ | پیتە نەرمەکان (اللّين) لەگەڵ پیتەکانی وەك خۆیان ئیدغام دەبن، وەکوو: ﴿بِمَا عَصَوا وَّكَانُوا۟﴾ |

## ياساكانی خوێندنەوەی یەكێك لە دوو مەددەكانی پێكەوە

زۆرجار دەبینین دوو جۆرە مەدد پێكەوە لە وشەیەكدا یان لە دوو وشەدا دێن, بەهۆی پەیدابوونی دوو هۆكار بۆ دروستبوونی مەددە لەسەر پیتێكی مەددە, وەكوو (هەمزە و سكون) یان (دوو هەمزە), بێگومان یەكێك لەو دوو مەددانە بەهێزتر دەبێت, بۆیە پێویستە ئەو پیتە مەددەیە, بەپێی مەددە بەهێزترەكە بخوێنیتەوە.

الشّیخ إبراهیم علي شحّاتة (السَّمنودي) مەددە بەهێزەكانی, یەك لە دوای یەك, لەم چەند دێڕەشیعرەدا دیاری كردوون:

أقوَى المُدُود لازم فما اتَّصل ....... فعارضٌ فذوا انفِصالٍ فَبدل[1]
ثُـمَّ الطّـبيعيُّ فاللّـينُ يافَـتى ....... واللِّين أضْعَف المُدودِ قَد أتَى
وسَـبَبا مـدٍ اذا مَـا وُجِـدا ........ فإنّ أقـوى السَّـببينِ انفَـرَدا

**واتا:**

درێژكراوی (مەددە) لە هەموان بەهێزتر, (مد اللازم)ە, ئینجا (مد الواجب المتصل)ە, پاشان (مد العارض للسّكون)ە, ئینجا (مد الجائز المنفصل)ە, پاشان (مد البدل)ە, ئینجا (مد الطبيعي)ە, پاشان(مد اللين)ە[2]هەروەها ئەگەر دوو هۆكاری درێژكردنەوەی مەددە (هەمزە یان سكون) لەسەر پیتێكی مەددە كۆبوونەوە, پیتە مەددەكە, بەپێی هۆكارە بەهێزترەكە دەخوێندرێتەوە.

---

( ╖ ) - هەردوو دێڕی یەكەم و سێیەم (لآلئ البيان في تجويد القرآن /╖ی-╖ی)

(╖) - مەددی نەرم (مد اللين), لە گشت جۆرە مەددێك لاوازترە، چونكە پیتی مەددە, پیتێكی ناڕەسەنە, هەروەها هۆكاری درێژكردنەوەی پیتی مەددەش ناڕەسەنە, واتە كاتێك خوێنەر بەسكون لەسەری دەوەستێت, پیتە مەددەكە پەیدا دەبێت و درێژ دەبێتەوە.

**ﭠ- دوو جۆرە مەدد لە وشەیەکدا:** ئەگەر دوو هۆکار بۆ درێژکردنەوەی پیتێکی مەددە لە وشەیەکدا هاتبن, پیتە مەددەکە بەپێی هۆکارە بەهێزترەکە دەخوێندرێتەوە, وەك (مد الواجب المتصل) و(مد العارض للسّكون), لەخوارەوە هەندێك جار بە (مد الواجب) دەخوێندرێتەوە و هەندێك جاریش بە(مد العارض), ئەویش بەپێی هێزەکەیانەوە:

| نموونة | ﴿ فَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۗ ﴾ (البقرة:شمتيير) |
|---|---|

**(مد الواجب المتصل) لەگەڵ ( مد العارض للسّكون) لە وشەی( يَشَآءُۗ ) (1)**

| خوێندنەوەی(مدالعارض) بە(یر،شم، □)حەرەکە | خوێندنەوەی (مد الواجب) بە(شم)حەرەکە | خوێندنەوەی مەددی بەهێز لە کاتی وەستان | هۆکار (السَّبب) |
|---|---|---|---|
| یر | شم | شم | کار بە سکون ناکرێت دەبێتە (مد الواجب) |
| شم | شم | شم | مەددی دوو ناوە |
| □ | شم | □ | کار بە سکون دەکرێت |

| خوێندنەوەی(مدالعارض) بە (یر،شم، □) حەرەکە | خوێندنەوەی (مد الواجب) بە (لە )حەرەکە | خوێندنەوەی مەددی بەهێز لە کاتی وەستان | هۆکار (السَّبب) |
|---|---|---|---|
| یر | لە | لە | کار بە سکون ناکرێت دەبێتە (مد الواجب) |
| شم | لە | لە | کار بە سکون ناکرێت دەبێتە (مد الواجب) |
| □ | لە | □ | کار بە سکون دەکرێت |

---

( ﭠ ) بۆ دروستکردنی ئەم خشتەیە, سوود لە کتێبی (التجويد المصور) وەرگیراوە.

## خشتەی خوێندنەوەی دووجۆرە مەددە پێکەوە

| نموونە | هۆکاری یەکەم بۆ درێژکردنی پیتی مەدد | هۆکاری دووەم بۆ درێژکردنی پیتی مەدد | خوێندنەوەی کۆتایی بۆ پیتی مەدد |
|---|---|---|---|
| ءَآمِّينَ | هەمزەی پێش پیتی مەدد دەبێتە (مد البدل) | سکون دوای پیتی مەددە دەبێتە (مد اللّازم) | بەپێی (مد اللّازم) دەخوێندرێتەوە |
| إِنَّا بُرَءَآؤُاْ مِنكُم | هەمزەی پێش پیتی مەدد دەبێتە ( مد شبيه البدل ) | هەمزەی دوای پیتی مەدد دەبێتە (مد الواجب المتصل) | مەددی پێویستی بەیەکگەیشتوو دەخوێندرێتەوە (مد الواجب المتصل) |
| مُسْتَهزِءُونَ | هەمزەی پێش پیتی مەددە دەبێتە (مد شبيه البدل) | لە کاتی وەستان، سکون دوای پیتی مەددە دەبێتە ( مد العارض للسّكون ) | لە کاتی وەستان، بە (مد العارض للسّكون)یانیش (شبيه البدل) دەخوێندرێتەوە |
| فلمَّا رَءَآأَيْدِيَهُم | هەمزەی پێش پیتی مەددە دەبێتە (مد شبيه البدل) | هەمزەی دوای پیتی مەددە لە وشەی دووەمدا دەبێتە (مد الجائز المنفصل) | کاتی بەیەکگەیانەن، دەبێتە (المد المنفصل) هەروەها لە کاتی وەستانیش، دەبێتە (مد شبيه البدل) |
| ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ أَغْنِيَآءُ | هەمزەی دوای پیتی مەددە دەبێتە (المد الواجب المتصل) | لە کاتی وەستان، سکون دوای پیتی مەدد دەبێتە ( مد العارض للسّكون ) | کاتی بەیەکگەیانەن، دەبێتە (مد الواجب) لە کاتی وەستان، دەبن بە دوو جۆری مەدد (1) |

**بۆ زانین:** هەر وشەیەك بە هەمزە کۆتایی هاتبێت، دوای پیتی مەددە، وەکوو (أَغْنِيَآءُ)، نابێت بەدوو حەرەکە لەسەری بوەستین، چونکە مەددی پێویست (مد الواجب)، لە مەددی تووشبوو بە سکون (مد العارض للسكون) بەهێزترە.

---

(1) هەندێك جار لە یەك دانیشتنی خوێندنەوەدا و لە وشەیەك یان دوو وشەدا، دوو جۆرە مەدد کۆبوونەتەوە، بەڵام پێویستییان بە ڕوونکردنەوە هەیە، چونکە هەرجارێك، مەددێك لە مەددێکی دیکە بەهێزتر دەخوێندرێتەوە، وەکوو: کاتی وەستان، لەسەر ئەم وشانە: ﴿ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ ﴾ ﴿ سُوٓءَ ﴾ ﴿ بُرَءَآؤُاْ ﴾ ﴿ يَشَآءُ ﴾ ﴿ أَغْنِيَآءُ ﴾ هەندێك جار بە مد الواجب دەوەستین، هەندێك جاریش بە مد العارض للسّكون دەوەستین.
بۆ زانیاریی زیاتر، بگەڕێنەوە بۆ لاپەڕەی پێشتر.

## یر- دوو جۆرە مەدد لە دوو وشەدا :

أ- ئەگەردوو یان سێ مەددی هاوشێوە لە ئایەتێکدا یان لـە خوێندنـەوەی یـەك دانیشـتندا هاتبن, پێویستە لەسەر قورئانخوێنەکە, کـە هـەموو جـۆرە مـەددێکی هاوشـێوە, بـە یـەك ئەندازە بخوێنێتەوە[1] هەروەك ئیمامی جەزەری دەڵێت: (واللَّفظُ في نظيرهِ كَمِثلِه )[2]، وەکوو:

﴿إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾ (يس: يرتي )

﴿ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ (البقرة : يرير)

ب- ئەگەر (مد الواجب المتصل) لەگەڵ (مد الجائز المنفصل) لـە ئایەتێکـدا, یـاخود لـە دانیشتنێکی خوێندنەوەدا هاتبن, ئەوا بەپێی مەددی یەکەم دەخوێندرێتەوە, بە (شم) یان ( لھ) حەرەکە، وەکوو:

﴿قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ﴾ (البقرة:سمسم)

﴿مُّذَبۡذَبِينَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِۚ﴾ (البقرة: لهتي)

ئەگەر مەددی تووشبوو بە سکون (**مد العارض للسّكون**) پێش مەددی نەرم (**مد اللين**) هاتبێت, ئەوا پێویستە (**مد اللين** ) بە ئەندازەی (**مد العارض للسّكون**) بخوێندرێتەوە, یاخود کەمتر، چونکە (**مد العارض للسّكون**) لە **مد اللين** بەهێزترە, **وەکوو:**

﴿وَلَا تَنقُصُوا۟ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَۚ إِنِّيٓ أَرَىٰكُم بِخَيۡرٖ﴾(1)

| مدّ العارض للسّكون | مدّ اللّين |
|---|---|
| 2 | 2 |
| 4 | 2 ، 4 |
| 6 | 2 ، 4 ، 6 |

ئەگەر (**مد اللّين**) پێش (**مد العارض للسّكون**) هاتبێت, پێویستە (**مد العارض للسّكون**) لە (**مد اللّين**) درێژتر بخوێندرێتەوە, یاخود بە ئەندازەی ئەو بخوێندرێتەوە، **وەکوو:**

﴿بِيَدِكَ ٱلۡخَيۡرُۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾(2)

| مدّ اللّين | مدّ العارض للسّكون |
|---|---|
| 2 | 6 ، 4 ، 2 |
| 4 | 6 ،4 |
| 6 | 6 |

هەروەك (الشيخ المحقق مصطفى الميهي الأحمدي)دەڵێت[3]:

وكُلُ مَن قَصَر حرفَ اللين ثَلاثَةٌ تجري بِنَحوالِدين
وإن تُوَسِطْهُ فوَسِط أشبِعا وإن تَمُدَّهُ فَمُدَّ مشبِعا

---

(١) سورة هود:شمتي (٢) سورة آل عمران : ير (٣) هداية القاري:(ترصسمسمه)

# بەشی شەشەم

- هەمزەی بڕین و هەمزەی گەیاندن ( همزة القطع و همزة الوصل )
- یر- حەرەکەی هەمزەی گەیاندن ( حركة همزة الوصل )
- ئاسانکردن ( التسهيل )
- شم- لارکردنەوە ( الامالة )
- حەوت ئەلیف لە قورئاندا ( الالفات السبع )
- ئیشمام و ئیختلاس ( الاشمام و الاختلاس )
- دەنگ بەرزکردنەوە ( النَّبر )
- تی- پیتە نووسراوەکان و نەخوێندراوەکان ( الحروف المتروكة لفظًا )
- ئەو وشانەی بە دوو ڕێگا دەخوێندرێنەوە ( الكلمات التي تقرأ بوجهين )

## هەمزەی بڕین (همزة القطع)(ء) و هەمزەی گەیاندن (همزة الوصل)(ٱ)

ﭢ- هەمزەی بڕین (همزة القطع)[1] (ء): پیتێکە لەسەرەتا یان ناوەند یان کۆتایی وشە دەنووسرێتەوە, هەروەها هەندێك جار بەتەنیا نووسراوە, هەندێك جاریش لەسەر پیتەکانی (ا، و، ي )نووسراوە، هەموو حەرەکەیەك وەردەگرێت, یاخود ساکنە، لە ڕیوایەتی ئیمام (حفص)دا, لە ناوەندی وشە و کۆتایی وشە, بە شێوەیەکی ئاشکرا دەخوێندرێتەوە, بەڵام ئەگەر لە سەرەتای وشە لەگەڵ هەمزەی بەیەکگەیاندن هاتبێت, ئەوا هەردوو هەمزەکە بە شێوەیەکی جیاواز دەخوێندرێنەوە، لە بابەتەکانی ئاییندەدا, شی دەکەینەوە:

نموونة ﴿ وَأَيُّوبَ ، يَتَفَيَّؤُاْ ، يَشَآءُ ، سُئِلَتۡ ، إِصۡلَٰحٗا ، هَٰٓؤُلَآءِ ﴾

ﭣ- هەمزەی گەیاندن (همزة الوصل)[2] : بریتییە لە پیتی هەمزە, وێنەکەی, سەری پیتی (ص)(ﺻ), کە لەوشەی(صِلَة) هاتووە لەسەر ئەلیفەکە (ٱ) انراوە، لە دەستپێکی ئەو پیتانە دەنووسرێت, کە بە پیتێکی ساکن دەستیان پێکردووە, لە کاتی بەیەکگەیاندنی ئایەتەکەش ناخوێندرێتەوە، بەڵام ئەگەر لەو وشەیەوە دەست بەخوێندنەوە بکرێت, ئەوا دەخوێندرێتەوە, بەڵام دوای ئەوەی کە حەرەکەیەکی بۆ دادەنرێت، نموونە:

| ئایەت | لە کاتی بەیەکگەیاندن | لەکاتی دەستپێکردن |
|---|---|---|
| قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ | قَالُدۡعُ لَنَا رَبَّكَ | أُدۡعُ لَنَا رَبَّكَ |
| فَقُلۡتُ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ | فَقُلۡتُ سۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ | إِسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ |
| قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهۡبِطۡ بِسَلَٰمٖ | قِيلَ يَٰنُوحُهۡبِطۡ بِسَلَٰمٖ | إِهۡبِطۡ بِسَلَٰمٖ |
| وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ | وَقَالَ رَبُّكُمُدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ | أُدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ |

---

( ﭢ) بەم ناوە ناونراوە، چونکە پێش خۆی و دوای خۆی لێك دادەبڕێنێت.

(ﭣ) بەم ناوە ناونراوە، تاکوو خوێنەر بتوانێت بە هۆی ئەوەوە, وشەیەك کە بە پیتێکی ساکن دەستپێکردووە, بخوێنێتەوە, هەروەها بۆ ئەوەی پێش خۆی و دوای خۆی پێکەوە گرێ بدات.

× بەتەواوی ناوی ئەم پیتە (ٱ)هەمزەیە (همزه الوصل), بەڵام ئەم زانایانە: (الكسائي والفراء وسيبويه) ڕێگەیانداوە کە ناوی ئەلیفی لێبنێین(الف الوصل)، چونکە وەکوو ئەلیف دەنووسرێت.

## حەرەکەی هەمزەی گەیاندن (حركة همزة الوصل)

هەمزەی گەیاندن لە سەرەتای (پیت و ناو و کارەکان) نووسراوە و بەم شێوەیەی خوارەوە:

أ- لەگەڵ پیتەکان: لە سەرەتای پیتی (لام)ی ساکن نووسراوە و پێی دەڵێن: لامی پێناساندن ( ألْ التعریف), لە کاتی بەیەکگەیاندن دەسڕێتەوە, بەڵام لە کاتی دەستپێکردن, هەمزە بە فەتحە دەخوێندرێتەوە, وەکوو:

﴿ ٱللَّه ، ٱلتَّواب ، ٱلجَبل ﴾ بە ﴿ أَللَّه ﴾ ﴿ أَلتَّواب ﴾ ﴿ أَلجَبل ﴾ دەخوێندرێنەوە

ب- هەمزەی گەیاندن لەگەڵ ئەم کارانە هاتووە

| کاری ڕابردوو لە پێنج پیت و شەش پیت پێکهاتبێت، وەکوو: (ٱنطَلَقَ , ٱسْتَكْبَرَ ) | کاری داخوازی, کە کارە ڕابردووەکەی لە سێ پیت و پێنج پیت و شەش پیت پێکهاتبێت، وەکوو: (ٱكْتُبْ , ٱنطَلِقْ , ٱسْتَـْٔجِرْهُ ) |
|---|---|

### حەرەکی هەمزەی گەیاندن لە سەرەتای خوێندنەوەی کارەکان (الافعال)

| ١- خوێندنەوەی هەمزە بە بۆر(ضمة) | ٢- خوێندنەوەی هەمزە بە کەسرە |
|---|---|
| ئەگەر پیتی سێیەم لە وشەی کار (فعل) (ضمَة)یەکی ڕەسەنی لەسەر بێت, هەمزەی گەیاندن بە بۆر(ضمة), دەستپێدەکات، وەک: | ئەگەر پیتی سێیەم (کەسرە)ی لە ژێر بێت, یان(فەتحە)ی لەسەر بێت, هەمزەی گەیاندن بە کەسرە دەستپێدەکات، وەک: |
| ٱشْدُدْ بِهِۦٓ أَزْرِي ← أُشْدُدْ بِهِۦٓ أُزْرِي | ٱهْبِطْ بِسَلَامٍ ← إِهْبِطْ بِسَلَامٍ |
| ٱسْلُكْ يَدَكَ ← أُسْلُكْ يَدَكَ | ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ ← إِقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ |

پێنج وشە بە کار (فعل), لە قورئاندا هاتوون, پیتی سێیەم, بۆر(ضمة)ی لەسەرە, نارەسەنیشە, بۆیە لە کاتی دەستپێکردن, هەمزەی گەیاندن بە کەسرە دەخوێندرێتەوە[1] ، ئەو وشانەش بریتین لەمانە:

﴿ ٱمشُوا ، ٱمضُوا ، ٱقضُوا ، ٱبنُوا ، ٱئتُوا ﴾
﴿ إِمشُوا ، إِمضُوا ، إِقضُوا ، إِبنُوا ، إِيتُوا ﴾

## ئەم وشانە لەم ئایەتانەدا هاتوون

1- ﴿ ثُمَّ ٱقۡضُوٓاْ إِلَيَّ وَلَا تُنظِرُونِ ﴾ (يونس: ٧١)

2- ﴿ فَقَالُواْ ٱبۡنُواْ عَلَيۡهِم بُنۡيَٰنٗاۖ ﴾ (الكهف: ٢١)

3- ﴿ وَٱنطَلَقَ ٱلۡمَلَأُ مِنۡهُمۡ أَنِ ٱمۡشُواْ وَٱصۡبِرُواْ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمۡۖ ﴾ (ص: ٦)

4- ﴿أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِۖ ٱئۡتُونِي بِكِتَٰبٖ﴾ (الأحقاف:٤) ﴿ثُمَّ ٱئۡتُواْ صَفّٗاۚ﴾ (طه٦٤)

5- ﴿ وَلَا يَلۡتَفِتۡ مِنكُمۡ أَحَدٞ وَٱمۡضُواْ حَيۡثُ تُؤۡمَرُونَ ﴾ (الحجر: ٦٥)

**بۆ زانین: ئەم ئایەتەی کۆتایی, نابێت خوێنەر لە وشەی (ٱمۡضُوا) دەست بە خوێندنەوەی بکات, بەبێ خوێندنەوەی پیتی(و), چونکە نابێت لەسەر (واو ) بوەستێت.**

**زانیاری**

ئەگەر پیتی سێیەم, فەتحەی لەسەر بێت, هەمزەی گەیاندن بەفەتحە ناخوێندرێتەوە، چونکە ئەو وشەیە لە کاری داخوازی (فعل أمر)ەوە, دەبێتە کاری ڕانەبردوو (فعل مضارع), وەکوو: ( إِذۡهَب ) دەبێتە ( أَذۡهب )

---

[1] (ت) لە بنچینەدا کە ئەم وشانە دەکەینە کاری ڕانەبردوو (فعل مضارع), پیتی سێیەمیان کەسرەی لەژێرە, وەکوو: (يمشِي ، يقضِي ، يمضِي ، يبنِي ، يأتِي) یاخود دەکەینە کاری داخوازی (فعل امر) (امشِ، امضِ، اقضِ، ابنِ، ائتِ) بەدیاردەکەوێت کە پیتی سێیەم کەسرەی لەژێرە, بەڵام دوای زیادکردنی (واو)ی کۆ, دەبێت پێش(واو)ەکە, (ضمَة)ەکەش لە ڕەگەزی (واو)ەکە بێت:
(امشِوا، امضِوا، اقضِوا، ابنِوا، ائتِوا) ⟵ (امشُوا، امضُوا، اقضُوا، ابنُوا، ائتُوا) بۆیەش(ضمة)ی سەر پیتی سێیەم نارەسەنە.

**سم- هەمزەی گەیاندن لەگەڵ ناوەکان**

| (الاسماء السّماعية) وەکوو: | (الاسماء القياسية) وەکوو: |
|---|---|
| (ٱبۡن ، ٱبۡنَة ، ٱثۡنَيۡن ، ٱثۡنَتَيۡن ، ٱمۡرُؤ ، ٱمۡرَأة ، ٱسۡم) | ﴿ٱخۡتِلَٰفِ﴾ ﴿ٱبۡتِغَاءَ﴾ ﴿ٱسۡتِغۡفَارٗا﴾ ﴿ٱسۡتِكۡبَارٗا﴾ |

تر- (الاسماء السّماعية) بریتین لە حەوت ناو, لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون و هەمزەی گەیاندن لە سەرەتای ئەو ناوانەدا نووسراوە, لە کاتی بەیەکگەیاندن ناخوێندرێنەوە، بەڵام لەکاتی دەستپێکردن, هەموو کاتێك بە کەسرە دەخوێندرێنەوە، ئەو ناوانەش بریتین لەمانە:

(ٱبۡن ، ٱبۡنَة ، ٱثۡنَيۡن ، ٱثۡنَتَيۡن ، ٱمۡرُؤ ، ٱمۡرَأة ، ٱسۡم)

کاتی دەستپێکردن, ئاوا دەخوێندرێنەوە:

( إِبۡن ، إِبۡنَة ، إِثۡنَيۡن ، إِثۡنَتَيۡن ، إِمۡرُؤ ، إِمۡرَأة ، إِسۡم)

نموونە لەگەڵ وشەی(ٱمۡرُؤ)

| | | |
|---|---|---|
| ١ـ ﴿ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمۡرَأَ سَوۡءٖ ﴾(مريم:تيير) | کاتی دەستپێکردن | ( إِمۡرَءَ سَوۡءٖ) |
| ٢ـ ﴿ إِنِ ٱمۡرُؤٌ هَلَكَ ﴾ (النساء: لبيتر) | کاتی دەستپێکردن | (إِمۡرُؤٌ هَلَكَ) |
| ٣ـ ﴿ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ﴾ (النور: ترتر) | کاتی دەستپێکردن | (إِمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ) |

یر- (الاسماء القياسية): بریتییە لە چاوگی کاری ڕابردوو, لە پێنج پیت و شەش پیت پێکهاتووە، هەمزەی گەیاندن لە کاتی دەستپێکردن, لە گشت ئەو کاتانەدا بە کەسرە دەخوێندرێتەوە, وەکوو:

﴿ٱخۡتِلَٰفُ﴾ ﴿ٱسۡتِغۡفَارٗا﴾ ﴿ٱسۡتِكۡبَارٗا﴾ ← ﴿إِخۡتِلَاف﴾ ﴿إِسۡتِغۡفَارٗا﴾ ﴿إِسۡتِكۡبَارٗا﴾

## هەمزەی گەیاندن (همزة الوصل)(ٱ) پێش هەمزەی بڕاو(همزة القطع)(أ)

تر- ئەگەر لە کاتی بەیەکگەیاندنی ئایەتێك, هەردوو هەمزەکە لە وشەیەکدابن، ئەوا (همزة الوصل)(ٱ) ناخوێندرێتەوە, بەڵکوو تەنیا (همزة القطع) (أ ) دەخوێندرێتەوە.

یر- ئەگەر لە وشەیەکەوە دەست بە خوێندنەوە بکەین, کە (همزة الوصل) لە پێش (همزة القطع)ی ساکن هاتبێت, بۆیە هەمزە ساکنەکە (همزة القطع) دەگۆڕدرێت بۆ پیتێکی مەدد لە ڕەگەزی حەرەکەی هەمزەی گەیاندن, حەرەکەی هەمزەی گەیاندنیش لە پیتی سێیەم وەردەگیرێت و جۆرێکی مەددە پەیدا دەبێت, کە پێی دەڵێن: (مد البدل).

### نموونە لەسەر هەردوو خاڵی سەرەوە

| ئایەت | کاتی بەیەکگەیاندن | کاتی دەستپێکردن |
|---|---|---|
| وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ (1) | وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ئۡتِنَا بِمَاتَعِدُنَا | إِيـتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ |
| أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِۖ ٱئۡتُونِي بِكِتَٰبٖ (2) | أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِۖ ئۡتُونِي بِكِتَٰبٖ | (إِيـتُونِي) لەبنچینەدا پیتی سێیەم, کەسرەی لەژێر (ٱيتِي)یە, بۆیە هەمزەی دووەم دەبێتە یاء |
| قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا ٱئۡتِ بِقُرۡءَانٍ (3) | لِقَآءَنَ ئۡتِ بِقُرۡءَانٍ | إِيـتِ بِقُرۡءَانٍ |
| وَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ ٱئۡذَن لِّي وَلَا تَفۡتِنِّيٓۚ (4) | يَقُولُ ئۡذَن لِّي وَلَاتَفۡتِنِّيٓۚ | إِيـذَن لِّي وَلَا تَفۡتِنِّيٓۚ |
| فَلۡيُؤَدِّ ٱلَّذِي ٱؤۡتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ (5) | فَلۡيُؤَدِّ ٱلَّذِي ؤۡتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ | أُوتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ |

---

(تر) سورة الاعراف: بیپی
(یر) سورة الاحقاف:شم
(سم) سورة یونس: لهتر
(شم) سورة التوبة: ئیشم
(لە) سورة البقرة:سمتییر

## هەمزەی بڕین (همزة القطع) پێش هەمزەی گەیاندن (همزة الوصل)

سەرەتای وشە, هەندێك جار هەمزەی بڕین (أ) پێش هەمزەی گەیاندن ( ٱ ) هاتووە, جا چ ئەو وشەیە ( ‌ڕ- کار بێت ‌ڕ- ناو بێت سە- پیت بێت ) لە قورئانی پیرۆزیشدا بەم ڕێگایانەی خوارەوە هاتووە:

‌ڕ- لەگەڵ کار(فعل)ەکان: وەکوو پرسیار هاتووە و هەمزەی گەیاندن نەنووسراوە, هەروەها هەموو کاتێك فەتحە دەکەوێتە سەر (همزة القطع), کە پێی دەڵێن: هەمزەی پرسیار (همزة الاستفهام)، وەکوو:

﴿ أَطَّلَعَ ٱلۡغَيۡبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحۡمَٰنِ عَهۡدٗا ﴾ ﴿ أَصۡطَفَى ٱلۡبَنَاتِ عَلَى ٱلۡبَنِينَ ﴾

﴿ أَسۡتَكۡبَرۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡعَالِينَ ﴾

حەوت وشە لە قورئانی پیرۆزدا بە هەمزەی پرسیاری نووسراون، کە لەبنچینەدا پێویست بۆ هەمزەی گەیاندن (همزة الوصل) دوای هەمزەی بڕین (همزة القطع) نووسرابوایە, بەڵام چونکە هەمزەی گەیاندن لە کاتی بەیەکگەیاندن ناخوێندرێتەوە و نانووسرێت, بۆیە هەمزەی پرسیاری شوێنی ئەویش دەگرێتەوە و بەفەتحە دەخوێندرێتەوە و دەنووسرێت[1]،

ئەوانیش بریتین لەمانە:

| | | |
|---|---|---|
| ‌ڕ- ﴿أَتَّخَذۡتُم﴾ | (البقرة: ٨٠) | ‌ڕ- أ ٱتخذتم |
| ‌ڕ- ﴿أَطَّلَعَ﴾ | (مريم: ٧٨) | ‌ڕ- أ ٱطَّلَعَ |
| سە- ﴿أَفۡتَرَىٰ﴾ | (سبأ: ٨) | سە- أ ٱفترى |
| شە- ﴿أَصۡطَفَى﴾ | (الصافات: ١٥٣) | شە- أ ٱصطفى |
| لە- ﴿أَتَّخَذۡنَٰهُمۡ﴾ | (ص: ٦٣) | لە- أ ٱتَّخذناهم |
| ﴿أَسۡتَكۡبَرۡتَ﴾ | (ص: ٧٥) | أ ٱستكبرت |
| ﴿أَسۡتَغۡفَرۡتَ﴾ | (المنافقون: ٦) | أ ٱستغفرت |

ئەم وشانە, لەبنچینەدا بەم شێوەیە: ←

---

(‌ڕ) أحكام قراءة القرآن: (ص٣٣٥)

یر- لەگەڵ پیت (حرف)ەکان: هەمزەی بڕین (همزة القطع) پێش هەمزەی گەیاندن (همزة الوصل) بەتەنیا لەگەڵ پیتی (ل)ی پێناسین (لام التَّعريف) و لە سێ وشەدا هاتووە، ئەوانیش:

﴿ ءآللَّهُ ﴾ (2) ﴿ ءآلْـَٰٔنَ ﴾ (3) ﴿ ءَآلذَّكَرَيْنِ ﴾ (4)

ئەم وشانە, بەم دوو شێوەیەی خوارەوە دەخوێندرێنەوە:

أ- گۆڕین (الابدال): گۆڕینی هەمزەی دووەم بە پیتێکی(مەددە), کە لە ڕەگەزی حەرەکەی هەمزەی یەکەم بێت، وەکوو:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ءآللَّهُ | بە | ءآللَّهُ | دەخوێندرێتەوە و دەنوسرێتەوە |
| ءآلْـَٰٔنَ | بە | ءآلْـَٰٔنَ | دەخوێندرێتەوە و دەنوسرێتەوە |
| ءَآلذَّكَرَيْنِ | بە | ءآلذَّكَرَيْنِ | دەخوێندرێتەوە و دەنوسرێتەوە |

ب- ئاسانکردن (التسهیل): بریتییە لە خوێندنەوەی هەمزەی دووەم لە نێوان هەمزە و پیتی مەددەدا، وەکوو:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ءآللَّهُ | بە | ءألله | دەخوێندرێتەوە |
| ءآلْـَٰٔنَ | بە | ءألْـَٰٔنَ | دەخوێندرێتەوە |
| ءَآلذَّكَرَيْنِ | بە | ءَألذَّكَرَيْنِ | دەخوێندرێتەوە |

سە- لەگەڵ ناو (اسم)ەکان: لە قورئانی پیرۆزدا, (همزة القطع) لەگەڵ ناوەکان پێش (همزة الوصل) نەهاتووە، وەکوو:

﴿ أَ ٱبنًا , أَ ٱسمًا ﴾ بە ﴿ أَبنًا , أَسمًا ﴾ دەنووسرێت و دەخوێندرێتەوە

(2) سورة الانعام:سەشمتر (3) سورة یونس: ني لە (4) سورة یونس : تر لە

## ئاسانکردن (التّسهيل)

(التّسهيل) لەڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە ئاسانکردن.

لەڕووی زاراوە (اصطلاحا)وە: ئاسانکردن لەگەڵ پیتی هەمزە دەخوێندرێتەوە, واتە خوێندنەوەی پیتی هەمزە (ء) لە نێوان هەمزەیەکی ئاشکرا (ء) و ئەلیفی مەددەدا( آ ),

( ء ← أ → آ )

ت- لەڕوایەتی (حفص)دا بەتەنیا وشەی (ءَأعۡجَمِيّ)پێویستە بەئاسانکردن بخوێندرێتەوە, چونکە سێ پیتی گەروو, بەدوای یەکدا هاتوون و بۆ خوێندنەوە قورسن، هەروەها بۆ ئەوەی یاسای ئاسانکردن بۆ ئێمە ناسراو بێت, هەروەك لە هەندێك دیالۆکادا دەخوێندرێتەوە.

﴿وَلَوۡ جَعَلۡنَٰهُ قُرۡءَانًا أَعۡجَمِيّٗا لَّقَالُواْ لَوۡلَا فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥٓۖ ءَأعۡجَمِيّٞ وَعَرَبِيّٞۗ﴾فصلت. شمشم)

وشە لەبنچینەدا ﴿ءَأعۡجَمِيّٞ﴾یە, بەڵام بە ﴿ ءَاعۡجَمِيّٞ ﴾ دەخوێندرێتەوە

نیشانەی ئاسانکردنی هەمزە لە قورئانی پیرۆزدا, بازنەیەکی ڕەش و پڕ لەسەر ئەلیف ( أ ) هەیە

ب- لە قورئانی پیرۆزدا, سێ وشە هەن, دروستە کە هەمزەی دووەم بە ئاسانکردن (تسهيل), یاخود بە (مەددە) بخوێندرێتەوە, بەڵام باشتر وایە بە (مد اللازم) بخوێندرێتەوە، ئەوانەش ئەمانەن:

| وشە لە قورئاندا | سووککردنی هەمزەی دووەم |
|---|---|
| ءَآلذَّكَرَيۡنِ | ءَألذَّكَرَيۡنِ |
| ءآللَّهُ | ءألله |
| ءآلۡـَٰٔنَ | ءألۡـَٰٔنَ |

**تێبینی**

هەندێك لەو هەڵەیانەی کە لەگەڵ وشەی ﴿ ءَأعۡجَمِيّٞ ﴾ دەکرێن:

1- أأعجَمِي ، 2- أهعجَمِي ، 3- أعجَمِي ، 4- ءاعجَمِي

## لارکردنەوە ( الأمالة )

( الأمالة ) لەڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە لار یان خوارکردنەوە.

لەڕووی زاراوە (اصطلاحا)وە: لارکردنەوە لەگەڵ پیتی (ئەلیف) دەخوێندرێتەوە, کە ئەلیف بەرەو(یاء) دەبەین و فەتحەی پێش ئەلیفیش بەرەو(کەسرە) دەبەین[1].

**جۆرەکانی لارکردنەوە (أنواع الامالة)**

- لارکردنەوەی گەورە(الامالة الكبرى)
- لارکردنەوەی بچووک (الامالةالصغرى)[2]

**لارکردنەوەی گەورە (الامالة الكبرى)**: لارکردنەوەی فەتحەیە بەرەو کەسرە و ئەلیف بەرەو یاء, واتە پیتی ئەلیف لە نێوان پیتی ئەلیف و پیتی یائدا دەخوێندرێتەوە, بەڵام دەنگەکە زیاتر بۆ یائەکە دەبێت[3].

بەپێی ڕیوایەتی ئیمام (حفص), بەتەنیا وشەی ﴿مَجۡرٜىٰهَا﴾ بەلارکردنەوەی گەورە دەخوێندرێتەوە، فەتحەی سەر پیتی (راء) بەرەو کەسرە دەبەین و ئەلیفی دوای رائیش بەرەو (یاء) دەبەین, واتە پیتی ئەلیف وەك پیتی (ێ)ی زمانی کوردی دەخوێندرێتەوە.

﴿ وَقَالَ ٱرۡكَبُواْ فِيهَا بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٜىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآۚ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ (سورة هود: ٤١)

﴿ مَجۡرٜىٰهَا ﴾ بە ﴿ مەجریها ﴾ دەخوێندرێتەوە



نیشانەی لارکردنەوە لە قورئاندا مەعینێکی بەتاڵ, یان بازنەیەکی تاریك لەژێر ڕائەکەدایە، بەم شێوەیە: ﴿مَجۡرٜىٰهَا﴾ ﴿ مَجۡرٜىٰهَا ﴾

---

(1) التجويد المصور:(ص٢٦٩) (2) التمهيد في علم التجويد:(ص١٢٢)

(3) لارکردنی بچووک (الامالةالصغرى): لە خوێندنەوەدا, ئەلیفەکە بەرەو یاءکە دەبەین, بەڵام دەنگی ئەلیفەکە زیاتر لە دەنگی یائەکە دەخوێندرێتەوە و ئەم جۆرە لارکردنەوەیەش لە ڕیوایەتی ئیمام (حفص)دا نەهاتووە، وەك لارکردنەوەی وشەکانی﴿ٱلۡكَٰفِرِينَ،ٱلنَّصَٰرَىٰ﴾لە ڕیوایەتی(ئیمام وەرش)دا و وشەکانی﴿مُوسَىٰ،ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾لە ڕیوایەتی(أبی عمرو البصری)دا.

## حەوت ئەلیف لە قورئاندا (الألِفاتُ السَّبع)

**الالفات السّبع:** حەوت ئەلیف لە کۆتایی حەوت وشەدا نووسراون، وێنەکەیان لە قورئانی پیرۆزدا، بازنەیەکی وەکوو هێلکە لەسەر ئەلیفەکە دانراوە ←( أ ) کە لەسەر ئەو وشانە دەوەستین، ئەلیف دەخوێندرێتەوە، بەڵام ئەگەر لەسەریان نەوەستین، ئەوا ئەلیفەکە ناخوێندرێتەوە، جا چ ئەو پیتەی بەدوایدا دێت ساکن بێت یاخود بەسەرۆژێر بێت، ئەو وشانەش بریتین لەمانە:

| ت | وشه | کاتی وەستان | کاتی بەیەکگەیاندن |
|---|---|---|---|
| تر | ﴿ أَنَاْ ﴾ (له گشت قورئاندا) | قَالَ إِنِّي أَنَا | قَالَ إِنِّي أَنَ أَخُوكَ (يوسف 69) |
| ير | ﴿ لَّٰكِنَّاْ ﴾ (الكهف:تيسم) | لَكِنَّا | لَكِنَّ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي |
| [illegible] | ﴿ ٱلظُّنُونَاْ ﴾ (الاحزاب:برتر) | وَتَظُنُّونَ بِالله الظُّنُونَا | وَتَظُنُّونَ بِالله ٱلظُّنُونَ هُنَالِكَ |
| شم | ﴿ ٱلرَّسُولَاْ ﴾ (الاحزاب:[illegible]) | يَٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا | يَٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَ وَقَالُواْ رَبَّنَآ |
| له | ﴿ ٱلسَّبِيلَاْ ﴾ (الاحزاب:بي[illegible]) | وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا | فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَ رَبَّنَآ ءَاتِهِمْ |
| [illegible] | ﴿ سَلَٰسِلَاْ ﴾ (الانسانشم) | إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَلَٰسِل<br>إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَا | إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَ وَأَغْلَٰلًا وَسَعِيرًا |
| [illegible] | ﴿ قَوَارِيرَاْ ﴾ (الانسان: لهتر) | وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا | وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَ قَوَارِيرَاْ مِن فِضَّةٍ |

---

([illegible]) المنير:(صشم[illegible]ير-له[illegible]ير)؛ التجويد المصور:(صترنيشم-لهنيشم)

ئەگەر دوای حەوت ئەلیف, پیتێکی ساکن یان بەسەروژێر هاتبێت, ئەلیفەکە لەکاتی بەیەکگەیاندن ناخوێندرێتەوە, وەکوو:

| ﴿ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ١٤﴾ (طه) | پەروەردگار دەفەرموێت |
| --- | --- |

**زانیاری**

وشەی (سَلَٰسِلَاْ) لە (سورة الانسان:٤) لە ڕیوایەتی ئیمام (حفص)دا, دروستە بە دوو شێوە لەسەری بوەستین:

أ- وەستان بەئەلیف, بە(سَلاسِلا) دەخوێندرێتەوە

ب- وەستان بە سکون لەسەر لام, بە(سَلاسِلْ) دەخوێندرێتەوە

وەکوو ئیمام (السَّمنودی)دەڵێت:

وفي سَلاسِلا ومَا آتَانِ قِفْ ....... بِالحَذفِ والاثْبَاتِ في اليَا والأَلِفْ (1)

بۆیە بازنەی سەر ئەلیفی (سَلاسِلاْ) جیاوازە لە بازنەی ئەلیفەکانی هەر شەش وشەی دیکە.

**زانیاری**

ئەلیفی وشەی (قَوَارِيرَا۠) لە (سورة الانسان: ١٥) یەکێکە لە حەوت ئەلیفەکان, بەڵام ئەلیفی وشەی (قَوَارِيرَاْ) لە ئایەتی(١٦)دا, یەکێك نییە لە حەوت ئەلیفەکان, هەردوو وشەکەش بەم دوو ڕێگایە دەخوێندرێنەوە:

أ- کاتی بەیەکگەیاندی ئایەتەکە: ﴿ وَيُطَافُ عَلَيۡهِم بِـَٔانِيَةٖ مِّن فِضَّةٖ وَأَكۡوَابٖ كَانَتۡ قَوَارِيرَ قَوَارِيرَ مِن فِضَّةٖ قَدَّرُوهَا تَقۡدِيرٗا ١٦﴾ (الانسان)

ب- أ- کاتی وەستان: ﴿ وَأَكۡوَابٖ كَانَتۡ قَوَارِيرَا ١٥ ﴾ وەستان ﴿ قَوَارِيرَ مِن فِضَّةٖ قَدَّرُوهَا تَقۡدِيرٗا ١٦﴾

ب- کاتێك لەسەر﴿قَوَارِيرَا۠﴾ی دووەم دەوەستین, بە سکون لەسەر رائەکە دەوەستین:

﴿وَأَكۡوَابٖ كَانَتۡ قَوَارِيرَ قَوَارِيرْ﴾

---

(1) لآلئ البيان في تجويد القرآن/ ٣٦٣

## ئیختلاس و ئیشمام

ج- **الاشمام:** لەڕووی زمانەوانییەوە : بریتییە لە بون کردن.

لەڕووی زاراوەوە (اصطلاحا): بریتییە لە نیشانکردن بە لێو بۆ بۆر(ضمة)، واتە دوای خوێندنەوەی پیتی(ضمة) لەسەر بە سکون، لێوەکانمان خرٍ دەکەینەوە بۆ دەرەوە، بەڵام دەنگی بۆر(ضمة)ی لێوە نایەت.

ح- **الاختلاس:** بریتییە لە خوێندنەوەیەکی خێرا بۆ حەرەکە، هەندێك زانا دەڵێن خوێندنەوەی دوو لەسەر سێی (سم/یر ) حەرەکەیە، (لە حەرەکەی ڕەوم زیاترە)، ئەم یاسایە لە کاتی بەیەکگەیاندن دەخوێندرێتەوە.

لەڕیوایەتی(حفص)دا بەتەنیا وشەی ﴿تَأۡمَنَّا﴾ بە (ئیختلاس و ئیشمام) دەخوێندرێتەوە.

★- خوێندنەوەی ئیشمام (الاشمام) لە وشەی ﴿تَأۡمَنَّا﴾: کاتێك دەست بەخوێندنەوەی نونی بەشەددە دەکرێت، پێویستە خوێنەر لێوەکانی بۆ خوێندنەوەی بۆر(ضمة) ئامادە بکات، بەڵام نابێت دەنگی بۆر(ضمة)ی لێوە بێت.

بۆ زانین: باشتر وایە ئەم وشەیە بە ئیشمام بخوێندرێتەوە.

﴿تَأۡمَنَّا﴾ **بە** ﴿تَأۡمَنۡــــــنَا﴾ دەخوێندرێتەوە

غوننەی درێژ لەگەڵ ئیشمام

×- خوێندنەوەی ئیختلاس(الاختلاس) لە وشەی﴿ تَأۡمَنَّا ﴾: ئەم وشەیە دەگەڕێنینەوە بۆ نووسینە ڕەسەنەکەی خۆی، کە لە دوو نون پێکهاتووە (تأمَنُنَا)، پاشان دەنگی بۆر ((ضمة)ی نونی یەکەم کەم دەکەینەوە و بەنزمی و خێرا دەخوێنینەوە.

﴿تَأۡمَنَّا﴾ **بە** ﴿تأمَنُنا﴾ (یوسف:11) دەخوێندرێتەوە

ئیختلاس لەم (ضمة)ەدا دەخوێندرێتەوە

**زانیاری**

(ئیختلاس) لە ناوەندی وشە دەخوێندرێتەوە و (ڕەوم)یش لەکاتی وەستان لە کۆتایی وشە دەخوێندرێتەوە، بەڵام زۆر زانا بە دروستیان زانیوە کە لەگەڵ وشەی(تَأۡمَنَّا)، لە شوێنی(ئیختلاس) پێی بڵێین (ڕەوم)، بەڵام وا دروستترە کە پێی بڵێین بە (ئیختلاس).

## جیاوازیی لە نێوان ( الروم ، الاختلاس ، الاشمام )دا

| ژ | ڕەوم ( الروم ) | ئیختیلاس ( الاختلاس ) | ئیشمام ( الاشمام ) |
|---|---|---|---|
| 1 | لەگەڵ کەسرە و (ضمة) دەخوێندرێتەوە | لەگەڵ فەتحە و کەسرە و(ضمة)دەخوێندرێتەوە | لەگەڵ (ضمة) دەخوێندرێتەوە |
| 2 | لە کۆتایی وشە و کاتی وەستان دەخوێندرێتەوە, وەکوو: (نَسْتَعِينُ , يُبَشِّرُكِ) | کاتی بەیەکگەیاندن لە ناوەندی وشە دەخوێندرێتەوە: (تَأْمَنَّا) | کاتی وەستان و بەیەکگەیاندن دەخوێندرێتەوە, وەکوو: (نَسْتَعِينُ)(تَأْمَنَّا) |
| 3 | سم□تر سێیەکی حەرەکەکە دەخوێندرێتەوە | سم□یر دوو لەسەر سێی حەرەکەکە دەخوێندرێتەوە | لێوەکان بۆ بۆر(ضمة) ئامادە دەبن, بەلاّم ناخوێندرێنەوە |
| 4 | لە هەندێك شوێن, لەگەڵ (هائ گەیاندن) دەخوێندرێتەوە و لە هەندێك شوێنیش ناخوێندرێتەوە(1) | لەگەڵ گشت پیتێك دەخوێندرێتەوە | هەروەکوو ڕەوم وایە |
| 5 | گشت یاساکانی بەیەکگەیاندن لەگەڵ (ڕەوم) دەخوێندرێنەوە, وەکوو (مد العارض و تفخيم ترقيق........هتد) وەکوو:(يُبَشِّرُكِ ، نَسْتَعِينُ، الْمَجِيدُ) | هەروەك ڕەوم وایە | گشت یاساکانی وەستان لەگەڵ ئیشمام دەخوێندرێنەوە وەکوو: (قلقلة و مد العارض و تفخيم وترقيق ... هتد) |

نیشانەی ئیشمام لە قورئاندا ئەم وێنەیەیە, لە پێش نونەکە(◊)هەیە: ( تَأۡمَـ۫نَّا ) یاخود بازنەیەکی تاریکە (•): (تَأْمَنَّا)

(1) ئەم بابەتە لە لاپەڕە (□□□)دا, لە بابەتی ڕەوم و ئیشمام لە وەستاندا شی دەکرێتەوە.

## بەرزکردنەوە ( النَّبر )

**(النَّبر)** لەڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە دەنگبەرزی.

لەڕووی زاراوە(**اصطلاحا**)وە: واتە بەرزکردنەوەی دەنگ لە بڕگەیەك یان لە پیتێك، کە دەنگی پیتەکە لە هەر پیتێکی دیکەی دەوربەری بەرزتر دەخوێندرێتەوە [1].

پێویستە لەسەر قورئانخوێنەکە لەم پێنج شوێنەی خوارەوە نەبرە بداتە پیتەکە:

**ﭠ-** لە کاتی بەیەکگەیاندنی ئەم سێ ئایەتە:

﴿ وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾ ـــــ به ـــــ ﴿ وَقَالَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾ [2] دەخوێندرێتەوە

﴿ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ ﴾ ـــــ به ـــــ ﴿ فَلَمَّا ذَاقَ ٱلشَّجَرَةَ ﴾ [3] دەخوێندرێتەوە

﴿ وَٱسْتَبَقَا ٱلْبَابَ ﴾ ـــــ به ـــــ ﴿ وَٱسْتَبَقَ ٱلْبَابَ ﴾ [4] دەخوێندرێتەوە

لە کاتی بەیەکگەیاندنی ئەلیف، دەسڕێتەوە چونکە یەکێکە لە دوو پیتە ساکنەکان لە دوو وشەدا، بۆیە ئەگەر بێ نەبر بخوێندرێتەوە، واتای وشەکە لە جووتەوە دەگۆڕدرێت بۆ تاك.

**بۆ زانین:** ئەگەر واتای وشەکە لە جووتەوە بۆ تاك نەگۆڕدرێت، ئەوا بەبێ نەبر دەخوێندرێتەوە، وەکوو:

﴿ دَّعَوَا ٱللَّهَ رَبَّهُمَا ﴾ به ﴿ دَعَوَ اللَّهَ رَبَّهُمَا ﴾ [5] دەخوێندرێتەوە

﴿ وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴾ به ﴿ وَقِيلَ ٱدخُلَ ٱلنَّارَ ﴾ [6] دەخوێندرێتەوە

**ﭡ-** ئەگەر دوای پیتی مەددە، پیتێکی بەشەددە لە هەمان وشەدا هاتبێت، پێویستە بە (نەبر)ە لە پیتی مەددەوە بچین بۆ پیتی بەشەددە، تاکوو پیتی ساکن لە ناونیشانی توند **(الشَدَّة)**دا ون نەبێت، وەکوو:

﴿ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ ﴿ ٱلْحَآقَّةُ ﴾ ﴿ ءَآلذَّكَرَيْنِ ﴾

---

(1) التجويد المصور: (صسمبرشه) لهير

(2) سورة التَّمل: لهتر

(3) سورة الاعراف: يرير

(4) سورة يوسف:

(5) سورة الأعراف: نيتيتر

(6) سورة التحريم: برتر

سم- کاتێك خوێنەر لەسەر وشەیەك دەوەستێت, کە پیتی کۆتایی هەمزە (ء) بێت و پیتی پێش ئەویش, پیتێکی مەددە ( ا ، و ، ي)بێت, یان پیتێکی نەرم (و ، ي) بێت, تاکوو پیتی (ء) ون نەبێت، بەڵام بەمەرجێك, هەمزەکە دوو فەتحەی لەسەر نەبێت، وەکوو:

﴿ مِنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾ ﴿ بِكُلِّ شَيۡءٍ ﴾ ﴿ مِن سُوٓءٍ ﴾

شم- کاتێك خوێنەر وشەیەك دەخوێنێتەوە, پیتە (وّ، يّ) بەشەددەکانی تێدابن, جا چ لە ناوەندی وشە یان کۆتایی وشەدابن, تاکوو وەك پیتە مەددییەکان درێژ نەکرێنەوە، وەکوو:

﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم ﴾ ﴿ أُوْلِي ٱلۡقُوَّةِ ﴾ ﴿ إِيَّاكَ ﴾

لە- کاتێك خوێنەر لەسەر وشەیەك دەوەستێت, کە پیتی کۆتایی شەددەی لەسەر بێت، چونکە لەکاتی وەستان, هەردوو پیتەکەی لەناو نیشانەی گیرەدار (الشّدة) ساکن دەبن, بۆیە پێویستە بە نەبرە بخوێندرێتەوە, تاکوو هەردوو پیتەکە دیار بکەون، وەکوو:

﴿ مُّسۡتَمِرّٞ ﴾ ﴿ فَطَلّٞۚ ﴾ ﴿ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ ﴾

### لەو حاڵەتانەی کە (نەبر) ناخوێندرێتەوە:

تر-لەگەڵ پیتەکانی هەژان (قەلقەلە) (قطب جد) ناخوێندرێتەوە[1]کاتێك لەسەری دەوەستین و پێش ئەوانیش, پیتی مەددە نەهاتبێت وەکوو: ﴿ وَتَبَّ ، الحَقَّ ، الحَجُّ ﴾

یر- لەگەڵ پیتەکانی غوننە ناخوێندرێتەوە[2], ئەگەر شەددەی لەسەر بێت (مّ ، نّ) جا چ لە کاتی وەستان, یان بەیەکگەیاندن بێت, وەکوو: ﴿الٓمٓ ، وَلَآ ءَآمِّينَ، تَأۡمُرُوٓنِّي، فِي اليَمِّ، ولاجانٌّ﴾

---

(1) قەلقەلەی گەورە هەردوو پیتەکە دیار دەکات و پێویست بە نەبرە ناکات, بەڵام ئەگەر پیتێکی مەددە لە پێش پیتی قەلقەلە هاتبێت, لە کاتی وەستان و بەیەکگەیاندن بە نەبرە دەخوێندرێتەوە, چونکە پیتی مەددە, پیتی قەلقەلە لاواز دەکات, یاخود پیتێك ون دەکات, بەڵام نەبر ئەو پیتە دیار و بەرجەستە دەکات و هێزی پێ دەبەخشێت, وەکوو: ﴿ یشاقّ , الحاجِّ , حادَّ ﴾

(یر) (نەبر) لەگەڵ پیتەکانی (مّ , نّ) ناخوێندرێتەوە, چونکە غوننەی درێژ, هەردوو نونی ناو شەددەکە دیاری دەکات و پێویستی بە نەبرە نابێت.

## ئەو پیتانەی لە قورئاندا نووسراون و ناخوێندرێنەوە

سێ پیت لە قورئانی پیرۆزدا بەم شێوەیە نووسراون ( أْ ، وْ ، يْ )(1) , واتە بازنەیەکی بچووکیان لەسەرە و ناخوێندرێنەوە، وەکوو:

ت- پیتی(ا) ألف ، وەکوو: ﴿ آمنوا ، عملوا ﴾ ﴿ مِائة ، لِشَاْيءٍ ﴾ ﴿ ثمودَاْ ﴾
ی- پیتی (و) واو ، وەکوو: ﴿ أُوْلئك ، أُوْلي ، سَأُوْريكم , وَأُوْلَٰتُ ﴾
سە- پیتی (ي) ياء ، وەکوو: ﴿ بأَييْد ، مَلَإِيْهِ ، أفإيْن ﴾

ئەم پیتانە بەهۆی زۆر هۆکار, بۆ وشە زیاد کراون, وەکوو:

ت- دوای (واو)ی کۆ نووسراوە, تاکوو جیاوازیی بکرێت لە نێوان (واو)ی کۆ و (واو)ی ڕەسەن, کە پێی دەڵێن: (الالف الفارقة) وەکوو:

﴿قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ﴾ (الاعرافبىپیهم)

لە قورئانی پیرۆزدا, ئەم ئەلیفە(اْ) تەنیا لەگەڵ شەش وشە نەنووسراوە(2) ,
ئەو شەش وشەیەش بریتین لەمانە:

﴿بَآءُو , فَآءُو , جَآءُو , تَبَوَّءُو ﴾
﴿وَعَتَوْ ﴾ لە (سورة الفرقان) دا
﴿سَعَوْ ﴾ لە (سورة سبأ ) دا

ی- پیتی ئەلیف ( اْ ) لە کۆتایی هەندێك وشەدا نووسراوە, بە هۆی خوێندنەوەی ئەو وشەیە بە هەندێك جۆری خوێندنەوە بە تەنوینی فەتحە, کە لە کاتی وەستان, دەبێتە ئەلیف, وەکوو: ﴿ثمودَاْ﴾ لەم ئایەتەدا ﴿ وَثَمُودَاْ فَمَآ أَبْقَىٰ﴾
﴿قَوَارِيرَاْ﴾ی دووەم لە سورەتی الانسان دا ﴿ قَوَارِيرَاْ مِن فِضَّةٍ 16﴾
**بەڵام** لە ڕیوایەتی (حفص)دا, لە کاتی بەیەکگەیاندن و وەستان, ئەلیفەکە ناخوێندرێتەوە.

---

(ت) هەندێك بەم پیتانە دەڵێن پیتە زیادەکان, بەڵام جوان نییە لەگەڵ قورئاندا ئەم ناوەی لێ بنێین, چونکە پەروەردگار هیچ پیت و وشە و ئایەتێك لە قورئاندا دانابەزێنێت, کە بێ واتا بن, یاخود زیاد بن.
(ی) إعجاز رسم القرآن وإعجاز التلاوة: (صرشم□تىدلمه)

سە- پیتەکانی ( أْ ، وْ، يْ ) لە هەندێك وشەدا نووسراون, بەڵام ناخوێندرێنەوە, تاکوو ئەو دوو وشانە لێکجیا بکرێنەوە, کە لە کۆندا وەك یەك دەنووسران، وەکوو:

( أُوْلَٰٓئِكَ ) بۆ لێکجیاکردنەوەی ( أُلئك و إليك)
(مِاْئَةِ) بۆ لێکجیاکردنەوەی (مئة و منه)
(لِشَاْيْءٍ ) بۆ لێکجیاکردنەوەی (شيء و سيء)

شە- پیتەکانی ( أْ ، وْ ، يْ ) لە هەندێك وشەدا نووسراون, وەك نیشانەیەك بۆ هەمزە و حەرەکەکەیشی دیاری دەکات[1]، وەکوو:

﴿ لَأَاْذۡبَحَنَّهُۥٓ ﴾ هەمزە, فەتحەی لەسەرە
﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ هەمزە, (ضمَة)ی لەسەرە
﴿ وَمَلَإِيْهِ ﴾ هەمزە, کەسرەی لەژێرە

لە- پیتی (واو) لە هەندێك وشەدا, نیشانەی ئەوەیە کە ئەو پیتەی لە شوێنی (واو) دەخوێندرێتەوە, کە ئەلیفە, بنەچەکەی لە پیتی (واو)ەوە هاتووە, وەکوو:

﴿ٱلصَّلَوٰةَ , ٱلزَّكَوٰةَ , ٱلرِّبَوٰاْ ﴾

- هەندێك پیت, وەکوو ( ا، ی، ت ) لە هەندێك وشەدا زیاد کراون, تاکوو واتایەکی جیاواز یان بەرفراوانتر بە وشەکە ببەخشێت[2] وەکوو:

﴿ فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ أَن يَظۡهَرُوهُ وَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقۡبٗا ٩٧ ﴾ (الکهف:بیبهنی)
﴿ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابٗا شَدِيدًا أَوۡ لَأَاْذۡبَحَنَّهُۥٓ ﴾ (النمل: ▯یر)
﴿ وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ٤٧ ﴾ (الذاریات:بیی▯)

---

( ٢ ) لە کۆندا و پێش دابەزینی قورئان, پیتەکانی زمانی عەرەبی سەر و ژێریان نەبوو، بۆیە هەندێك جار ئەم پیتانە زیاد دەکران, وەك نیشانێك بۆ حەرەکەی پیتەکە (ئەلیف بۆ فەتحە و واو بۆ (ضمة) و یاء بۆ (کەسرە), تاکوو بەشێوەیەکی دروست بخوێندرێنەوە.

(یر) إعجاز رسم القرآن:(ص-ترسمتر-یرسمتر)؛ عنوان الدلیل:(ص▯له)

## ئەو وشانەی کە بە دوو ڕێگا دەخوێندرێنەوە لەڕیوایەتی (حفص)دا

| ژ | وشە | شێوازەکانی خوێندنەوە |
|---|---|---|
| 1 | ﴿ءَآللَّهُ﴾ ﴿ءَآلْـَٔنَ﴾یونس ﴿ءَآلذَّكَرَيْنِ﴾ (الانعام) | خوێندنەوەی ئەم سێ وشەیە بە مەددە, یاخود بە ئاسانکردن (التسهیل)ی هەمزەی دووەم. |
| 2 | ﴿تَأْمَنَّا﴾ (یوسف) | خوێندنەوەی بە ئیشمام(اشمام) یان بە ئیختلاس (الاختلاس) |
| 3 | ﴿ءَاتَىٰنِۦَ﴾ (النمل) | وەستان لەسەر ئەم وشەیە, بە خوێندنەوەی یاء ﴿آتَانِي﴾ یاخود وەستان لەسەر نون﴿آتَانْ﴾ |
| 4 | پیتی﴿ع﴾ لە سورەتەکانی (حم عسق) (شوری) (کهیعص) ( مریم) | خوێندنەوەی مەددی ناو پیتی﴿ع﴾ ﴿عَيْنْ﴾, بەدرێژکردنەوە بۆ (٦) یان (٤) حەرەکە. |
| 5 | ﴿ضَعْفٍ﴾ ﴿ضَعْفًا﴾ (الروم) | خوێندنەوەی پیتی(ض) لە هەرسێ وشەدا, بەفەتحە: ﴿ضَعْفٍ﴾﴿ضَعْفًا﴾ یان بە زەممە: ﴿ضُعْفٍ﴾﴿ضُعْفًا﴾ |
| 6 | ﴿فِرْقٍ﴾ (الشعراء) | خوێندنەوەی پیتی( ر)ی سـووك یان قـەڵەو, کاتی بەیەکگەیاندنی ئایەتەکە |
| [illegible] | ﴿ٱلْمُصَيْطِرُونَ﴾ (الطور) | خوێندنەوەی پیتی(ص) بەصـاد یان بە سـین, بەڵام بە صاد باوترە |
| [illegible] | ﴿سَلَٰسِلَا۟﴾ (الانسان) | وەستان بە ئەلیف ﴿سَلَاسِلَا﴾ یان بە سکونی لام ﴿سَلَاسِلْ﴾ |
| [illegible] | ﴿ٱلِٱسْمُ﴾ (الحجرات) | لە کاتی دەستپێکردن, بە یەکێك لەم دوو ڕێگایانە دەخوێندرێتەوە: ﴿أَلِسْمُ ٱلْفُسُوقُ﴾ یاخود بە﴿لِسْمُ ٱلْفُسُوقُ﴾ |
| [illegible] | ﴿الٓمٓ ١ ٱللَّهُ لَا اله الا هو﴾ (آل عمران) | کاتی بەیەکگەیاندنی ئەم دوو ئایەتانە: - خوێندنەوەی میم بەفەتحە و کورتکردنەوەی مەددەکەی. - خوێندنەوەی میم بەفەتحە و درێژکردنەوەی مەددەکەی. |
| [illegible] | ﴿مَالِيَهْ ٢٨ هَلَكَ﴾ (الحاقة) | کاتی بەیەکگەیاندن, بە سەکتە یان بێ سەکتە دەخوێندرێتەوە. |
| [illegible] | ﴿مِصْرَ﴾ , ﴿ٱلْقِطْرِ﴾ | خوێندنەوەی پیتی(راء)ی قەڵەو یان سووك لەکاتی وەستان. |

# تەجویدی شایان

## بۆ فێربونی قورئان

# بەشی

# وەستان و دەستپێکردن

# (الوقف والابتداء)

ضاثي يةكةم

يرشم[illegible]ه-[illegible]يربريم

## وەستان و دەستپێکردن ( الوقف والابتداء )

وەستان و دەستپێکردن (الوقف والابتداء) لە بابەتە گرنگەکانن بۆ خوێندنەوەیەکی دروست بۆ قورئانی پیرۆز، چونکە ئەم بابەتە دەبێتە هۆی ئەوە کە ئایەتەکانی قورئان بە هەڵە نەخوێندرێنەوە, تاکوو لەو واتایە دەرنەچن کە پەروەردگار پێی دابەزاندوون.




ت- وەستانی کورت (السکت): بریتییە لە وەستانێکی کورت لە نێوان دوو وشەدا, بۆ ماوەیەکی کەم (دووحەرەکە) بەبێ هەناسە لەکاتی بەیەکگەیاندن, بەمەبەستی تەواوکردنی ئایەتەکە[1]، نیشانەکەی لە قورئاندا پیتی(س)ە, لە نێوان دوو وشەدایە.

یر- وەستانی درێژ (الوقف): بریتییە لە وەستان لەسەر وشەیەك, لە ناوەڕاست یان کۆتایی ئایەتەکە, بۆ ماوەیەك, کە هەناسەی تێدا بێت, مەبەست لێی پشوودانە, پاشان خوێندنەوەکە [2] لە هەمان دانیشتندا تەواو بکرێت.

سم- بڕینی خوێندنەوە (القطع):بریتییە لە وەستان لە خوێندنەوەی قورئان, بەمەبەستی کارێکی جیاواز لە خوێندنەوە[3]، ئەم وەستانەش دەکەوێتە کۆتایی سورەتەکان, یان کۆتایی ئایەتەکان, دوای ئەوەی واتا وشیکردنەوەکە (إعراب) تەواو دەبێت.

---

(□) (ير) (□) غاية المريد: (صيريرير-شمسمير-□سمير)

## ﴿ وەستانە کورتەکان لە قورئاندا (السَّكت) ﴾

وەستانە کورتەکان (السّکت) لە ڕیوایەتی ئیمام (حفص)دا لە چوار شوێندا هاتوون, کە پێویستە لەکاتی بەیەکگەیاندن, وەستانێکی کورت و بێ هەناسە (دوو حەرەکە)[1] لەسەری بوەستین، ئەوانیش ئەمانەن:

تر- سورة الكهف: ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ١ قَيِّمٗا ﴾

کاتی بەیەکگەیاندنی ئەم دوو ئایەتە, بەبێ هەناسە(السّکت) لەسەر وشەی﴿ عِوَجَاۜ ﴾ دەوەستین, هەروەها دروستە ئەم دوو ئایەتە بەجیا بخوێندرێنەوە(بەوەستان لەسەر(عِوَجًا)).

ير- سورة يس: ﴿ قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرۡقَدِنَاۜۗ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ٥٢﴾

بەبێ هەناسە لەسەر وشەی ﴿ مَّرۡقَدِنَاۜ ﴾دەوەستین, پاشان خوێندنەکەی تەواو دەکەین, هەروەها دروستە لەسەر ئەم وشەیە بوەستین بەهەناسە(الوقف), ئینجا ئایەتەکە تەواو بکەین.

□- سورة القيامة: ﴿وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ ٢٧ ﴾ بەبێ هەناسە لەسەر وشەی ﴿مَنۡ﴾ دەوەستین.

□- سورة المطففين: ﴿ كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ١٤﴾ بەبێ هەناسە لەسەر وشەی﴿بَلۡ﴾ دەوەستین.

مەبەست لە وەستانی کورت (سکت), ئەوەیە تاکوو ئەو وشانەی پێکەوە دەخوێندرێنەوە, هیچ واتایەکی دیکە نەبەخشن و هەر وشەیەك بەجیا واتای خۆی ببەخشێت و هەروەها لە یاساکانی ڕیوایەتیشە.

**تێبینی**

لە ڕیوایەتی(حفص)دا, لە دوو ئایەتدا لەکاتی بەیەکگەیاندن, دروستە بەسەکتە بخوێنینەوە و دروستە پێکەوە بلکێنین و دروستیشە لەسەری بوەستین (الوقف)[2].

تر- ﴿مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ٢٨ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ ٢٩ ﴾ (الحاقّە)

ير- لە نێوان(سورة الانفال) و (سورة التوبة)دا:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ۜ ٧٥ بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ ﴾

---

(□) غاية المريد:(ص لهسمير) (ير) المنير:(صرشمتي تر)

شوێنەکانی وەستان لەسەر ئایەتەکانی قورئان

ﺗ- وەستان لە کۆتایی ئایەت

ﻳ- وەستان لە ناوەڕاستی ئایەت

ﺗ- وەستان لە کۆتایی ئایەت دا: ئەم وەستانە سوننەتە، چونکە پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەسەر ئایەتەکان دەوەستا، بەڵام نەك ئەو ئایەتانەی کە زور پێکەوە گرێدراون.

ﻳ- وەستان لە ناوەڕاستی ئایەت دا: ئەم وەستانە زۆر جۆری هەیە, بۆ پاراستنی ئایەتەکە لە خوێندنەوەیەکی ناڕاست, تاکوو ئایەتەکە واتایەکی هەڵە نەبەخشێت و بەهەڵە نەخوێندرێتەوە.

بۆ زانین: ئەم بابەتە لە لاپەڕەکانی داهاتوودا بە بەرفراوانی باس دەکرێت.

## جۆرە سەرەکییەکانی وەستان (أنواع الوقف)[1]

أ - وەستانی ئارەزوومەندانە (الوقف الاختياري): بریتییە لە وەستانێك, لە ناوەڕاستی ئایەتەکە, بەپێی حەزی قورئانخوێنەکە.

ب - وەستانی ناچاری (الوقف الاضطراري): کاتێك لەبەر هەر هۆکارێك و لەناکاو, خوێنەر ناچار دەبێت بوەستێت, وەکوو: (نەمانی هەناسە, یاخود پژمین و... هتد)

ج - وەستانی فەرمانپێکراو (الوقف الاختباري): بریتییە لە وەستانێك لە شوێنێکی ئایەتێك, کاتێك بەمەبەستی تاقیکردنەوە داوا لە قورئانخوێنەکە دەکرێت کە بوەستێت.

(1) المنح الفكرية:(ص؟ير) ؛ الميسر في علم التجويد:(ص٢٣)

## جۆرەکانی وەستانی ئارەزوومەندانە (اقسام الوقف الاختياري)

- وەستانی تەواو (الوقف التام).
- وەستانی كافی (الوقف الكافي).
- وەستانی باش (الوقف الحسن).
- وەستانی ناشیرین (الوقف القبيح).

**- وەستانی تەواو (الوقف التام):** کاتێك قورئانخوێن لە ناوەڕاستی ئایەتەکە یان کۆتایی ئایەتەکە دەوەستێت، تەواوەتی ئایەتەکە، یان ئەو ئایەتەی کە بەدوایدا دێت بەواتا و شیکردنەوە (إعراب) وابەستە نەبێت بە ئایەتی پێش خۆیەوە.

**نیشانەی وەستانی تەواو لە ناو ئایەتدا (م ، قلے)[1]**

**وەستانی تەواو (الوقف التام)**

**أ- وەستانی لازم (الوقف اللّازم):** بریتییە لە وەستانێك لە ناوەڕاستی ئایەتێك، کە بەهێزترین جۆری وەستانە، چونکە ئایەتەکە پێکەوە گرێدراو نییە.
نیشانەکەی لەسەر ئایەتەکە، پیتی (م)ە، وەکوو: ﴿إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسْمَعُونَ ۘ وَٱلْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ٣٦﴾[2]

**2- وەستانی تەواوی ڕەها (الوقف التّام المطلق):** بریتییە لە وەستانێك بەپێی حەزی قورئانخوێنەکە، نیشانەکەیشی لە قورئاندا (قلے)یە، واتە باشتر وایە قورئانخوێنەکە لای ئەم نیشانە بوەستێت، بەڵام بەیەکگەیاندنیش دروستە، وەکوو: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ﴾[3]

---

(1) الميسر في علم التجويد:(صەسەمەس)
(2) سورة الانعام
(3) سورة التغابن : ١١

٢- وەستانی کافی (الوقف الكافي): کاتێك قورئانخوێنەکە لە ناوەڕاست یان کۆتایی ئایەتەکە دەوەستێت, کە شیکردنەوە (إعراب)ی ئایەتەکە تەواو بووبێت، بەڵام واتایەکەی پەیوەست بێت بە تەواوەتی ئایەتەکەوە, یاخود ئەو ئایەتەوە کە بەدوایدا دێت.

نیشانەی وەستانی مامناوەند لەناو ئایەتەکەدا(ج ، صلے)[1].

**وەستانی مامناوەند (الوقف الكافي)**

تر- وەستان و بەیەکگەیاندن هەردووکی دروستە(الوقف الذي يحتمل الوجهين):
نیشانەکەی لە قورئاندا پیتی (ج)، وەکوو: ﴿ يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمَۢا ﴾[2]

یر- وەستان دروستە, بەڵام بەیەکگەیاندن باشترە (الوصل أولى):
نیشانەکەی لە قورئاندا (صلے)، وەکوو: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ ﴾[3]

سم- وەستانی باش (الوقف الحسن): بریتییە لە وەستانێك لە ناوەڕاست یان کۆتایی ئایەتێك، کە واتایەکی تەواو دەبەخشێت, بەڵام واتا و شیکردنەوەکەی پەیوەستە بە تەواوبوونی خوێندنەوەکەیەوە, ئەم وەستانەش, بەم دوو شێوازەی خوارەوە دەبێت:

أ- وەستان لە ناوەڕاستی ئایەتەکە: وەستان دروستە, بەڵام تەواوکردن دروست نییە، وەکوو:

﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ (فاطر: تر)

ب- وەستان لە کۆتایی ئایەتەکە: ئەم جۆرە وەستانە سوننەتە, بەڵام پێویستە ئایەتەکە واتایەکی هەڵە نەبەخشێت, جا چ لە کاتی وەستاندا بێت, یاخود لە کاتی تەواوکردنی ئەو ئایەتەدا بێت, کە بەدوایدا دێت, وەکوو:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ١ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ٢ ﴾ (المزّمّل)

---

[1] المیسر في علم التجوید:(صسسمتر)
[2] سورة الانسان: ترسم
[3] سورة المائدة: له

ئەگەر (الوقف الحسن) بكەوێتە كۆتایی ئایەتەكە و وەستانەكە ببێتە هۆی ئەوەی ئایەتەكە واتایەكی هەڵە ببەخشێت, لەوكاتەدا, زانایان بۆ ئەم جۆرە وەستانە, سێ بووچۆنیان هەیە:

تر- پێویستە هەردوو ئایەتەكە پێكەوە گرێبدرێن، چونكە واتای ئایەتی یەكەم پەیوەستە بەو ئایەتەی كە بەدوایدا دێت و دەبێتە وەستانێكی نادروست[1] وەكوو:
﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ٤ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ﴾ (المسدشە-لە).

یر- دروستە لەسەر ئایەتی یەكەم بوەستین، بەڵام پێویستە لە هەمان دانیشتندا, ئایەتی دووەم تەواو بكرێت[2] وەكوو نموونەی ڕابردوو.

سە- دروستە لەسەر ئایەتی یەكەم بوەستین، بەڵام نابێت ئەو ئایەتەی كە بەدوایدا دێت تەواو بكرێت، بەڵكوو دەبێت بگەڕێینەوە ئایەتی پێش ئەو و پێكەوە گرێبدرێن[3].

وا بەباش دەزانین: لە كاتی وەستان و دەستپێكردنی هەرئایەتێك, ئەم سێ خاڵە ڕەچاو بكەین:

تر- كاتێك لەكۆتایی ئایەتێك دەوەستین, دەبێت ئایەتەكە وابەستەی ئایەتی دوای خۆی نەبێت و هیچ واتایەكی هەڵەش نەبەخشێت، وەكوو: ﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ٤﴾وابەستەی دوای خۆیە.

یر- كاتێك لە كۆتایی ئایەتێك دەوەستین و ئایەتەكەش وابەستەی دوای خۆی بێت, باشتر وایە بگەڕێینەوە و پێكەوە ببەستینەوە.

سە- لە كاتی دەستپێكردن, پێویستە ئەو ئایەتەی كە دەخوێندرێتەوە, واتایەكی هەڵە نەبەخشێت، بەڵام هەركاتێك واتایەكی هەڵەی بەخشی, پێویستە بگەڕێینەوە ئایەتی پێش ئەو, ئینجا پێكەوە ببەستینەوە, وەكوو:

وەستان لەسەر ﴿أَلَآ إِنَّهُم مِّنۡ إِفۡكِهِمۡ لَيَقُولُونَ ١٥١﴾ دەستپێكردن لە ئایەتی ﴿ وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ١٥٢﴾(الصافات) نادروستە.

**زانیاری**

وەستان لە كۆتایی ئایەتەكان سوننەتە، بەڵام پێویستە ئەو سوننەت لە شوێنی دروستی خۆیدا جێبەجێ بكرێت، واتە پێویستە كاركردن بە سوننەت نەبێتە هۆی تێكدانی واتا و تەدەبوری ئایەتەكە، هەروەك خوای گەورە لەمبارەیەوە دەفەرمویت: ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٢٩﴾(ص: نيير), كەواتە لە هەموو ئایەتەكان كار بە سوننەتی وەستان ناكرێت,

هەروەها پێویستە بۆ دەستپێكردنیشی، ئەم خاڵە لەبەرچاو بگیرێت.

---

(1) نهاية القول المفيد:(صتي□ترني□تر) (2) نهاية القول المفيد:(صسم□تر) (3) العميد في علم التجويد:(صيتيترتيتيتر)

**زانیاری:** هەندێك جار دەبینین کە لە ئایەتێکدا, دوو شوێنی وەستان لە دوای یەکدا هاتوون, کە پێی دەڵێن: (وقف المعانقة), واتە: مانای ئایەتەکە لە هەردوو شوێنەکە تەواو بووە, بۆیە خوێنەر دەتوانێ لەسەر هەر نیشانەیەك بوەستێت, یاخود نەوەستێت، بەڵام کە لەسەر نیشانەیەك وەستا, نابێت لەسەر نیشانەی دووەم بوەستێت.

نیشانەی (وقف المعانقة) لە قورئاندا سێ خاڵی بچووکن لەسەر یەك ( ∴ ∴ )

نموونة ﴿الٓمٓ ١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ﴾ (البقرة:٢)

**ﺷﻢ- وەستانی ناشیرین (الوقف القبیح):** بریتییە لە وەستانێکی نادروست, لە ناوەڕاستی ئایەتەکە یان کۆتایی ئایەتەکە, چونکە واتا و شیکردنەوەی ئایەتەکە تەواو نەبوون و پەیوەستن بەوەوە کە ئایەتەکە بەتەواوی بخوێندرێتەوە.(1) بەڵام کاتێك خوێنەر بەناچاری دەوەستێت, پێویستە بگەڕێتەوە و ئایەتەکە پێکەوە ببەستێتەوە.

**وەستانە نادروستەکان بەم شێوەیەی خوارەوە پەیدا دەبن:**

تر- وەستان لەسەر وشەیەك, کە هیچ واتایەك نەبەخشێت, وەکوو وەستان لەسەر وشەی (إِيَّاكَ) لە ئایەتی﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ﴾یان وەستان لەسەر وشەی(بِسۡمِ) لە﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾.

یان وەستان لەسەر (يَشَآءَ ) لەم ئایەتەدا﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾.

یر- وەستان لەسەر وشەیەك, کە پەیوەست بێت بەدوای خۆیەوە بۆ شیکردنەوە,(2) وەکوو وەستان لەسەر:

-(مبتدأ) بێی (خبر), وەك وەستان لەسەر (ٱلۡحَمۡدُ ) ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ﴾

-(موصوف) بێی (صفة), وەك وەستان لەسەر (ٱلصِّرَٰطَ ) ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾

-(فعل) بێی (فاعل), وەك وەستان لەسەر (يَتَقَبَّلُ) ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾

-(مضاف) بێی (مضاف اليه), وەك وەستان لەسەر (بِسۡمِ) ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ﴾

-(مستثنى منه) بێی (مستثنى), وەك وەستان لەسەر (ٱلشَّيۡطَٰنَ)﴿لَٱتَّبَعۡتُمُ ٱلشَّيۡطَٰنَ إِلَّا قَلِيلٗا﴾

-معطوف عليه) بێی ( معطوف), وەك وەستان لەسەر (بِٱلۡغَيۡبِ) ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ 0

---

(1) المنير:(صەسمتیتر) (2) هداية القاري:(صەسمتیسە)

**سم**- وەستان لەسەر وشەیەك, کە ببێتە هۆی ئەوەی واتایەکی هەڵە ببەخشێت و ئەو واتایە نەبەخشێت کە پەروەردگار دەیەوێت, **وەکوو:**

وەستان لەسەر وشەی (أُمَّةً) و وشەی (وَٱلظَّٰلِمِينَ) لەم دوو ئایەتەدا:

﴿وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدۡيَنَ وَجَدَ عَلَيۡهِ أُمَّةً مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسۡقُونَ ﴾ (القصص:٢٣)

﴿يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمَۢا ٣١ ﴾ (الانسان:٣١)

**شم**- وەستان لەسەر وشەیەك, کە ببێتە هۆی بێڕێزی بەرامبەر بە پەروەردگار، **وەکوو:**

وەستان لەسەر وشەی ( لَا يَسۡتَحۡيِۦٓ ) و وشەی ( حَمَلۡتَهُۥ ) لەم دوو ئایەتەدا:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسۡتَحۡيِۦٓ أَن يَضۡرِبَ مَثَلٗا مَّا بَعُوضَةٗ فَمَا فَوۡقَهَاۚ ﴾ (البقرة:٢٦)

﴿رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَاۚ ﴾ (البقرة:٢٨٦)

**لە**- وەستان لەسەر وشەیەك, کە واتای کوفر ببەخشێت، **وەکوو:**

وەستان لەسەر وشەی ( أَوۡلِيَآءَ ) و وشەی( إِلَٰهَ) لەم دوو ئایەتەدا:

﴿إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾ (الاعراف:٢٧)

﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ﴾(محمد:١٩)

## نموونە لەسەر وەستانی دروست و وەستانی نادروست

| ئایەت | وەستانی دروست | وەستانی نادروست | هۆکار ( السبب ) |
|---|---|---|---|
| ﴿ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ﴾ ( الرحمن: [illegible] ) | أَيُّهَ | أَيُّهَا | بەبێ ئەلیف نووسراوە |
| ﴿ إِلۡ يَاسِينَ﴾ ( الصافات: [illegible] ) | إِلۡ يَاسِينۡ | إِلۡ | وشەیەکی پێکەوەیە و لێکجیانییە |
| ﴿ءَالَ دَاوُۥدَ ﴾ ( سبأ: [illegible] ) | ءَالۡ - ءَالَ دَاوُۥدۡ | — | دوو وشەی لێکجیان |
| ﴿ فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ ( النساء: [illegible] ) | فَمَا - فمالۡ | — | دوو وشەی لێکجیان |
| ﴿مَالِ هَٰذَا ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ( الكهف: [illegible] ) | مَا - مالۡ | — | دوو وشەی لێکجیان |
| ﴿أَيًّا مَّا تَدۡعُواْ ﴾ ( الإسراء: [illegible] ) | أَيًّا - أَيًّا مَّا | — | دوو وشەی لێکجیان |
| ﴿مِن تِلۡقَآيِ نَفۡسِيٓۚ﴾ ( يونس: [illegible] ) | مِن تِلۡقَآءۡ | تلقائي | یائی مەددەی پێوەنییە |
| ﴿شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ ﴾ ( الشورى: [illegible] ) | شُرَكَٰٓءۡ | شركائو | واوی مەددەی پێوەنییە |
| ﴿وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ﴾ ( التحريم: [illegible] ) ﴿وَيَمۡحُ ٱللَّهُ ٱلۡبَٰطِلَ﴾ الشورى: [illegible] | وَصَٰلِحۡ , وَيَمۡحۡ | وَصَالِحُو وَيَمۡحُو | واوی مەددە نەنووسراوە |
| ﴿ أَلَّا ﴾ ﴿ فيما ﴾ ﴿كلما﴾ (لە هەموو قورئان دا) | أَلَّا , فِيمَا , كُلَّمَا | أن , في , كل | پێکەوە نووسراون |
| ﴿ أن لَّا ﴾ ﴿ فِي مَا﴾ ﴿ كُلَّ مَا﴾ (لە هەموو قورئان دا) | أَنۡ یانژی أن لَّا<br>فِي یانژی في مَا<br>كُلَّ یانژی كُلَّ | — | لێکجیا نووسراون |

## شێوەکانی وەستان لەسەر وشەکانی قورئان

بێگومان وشەکانی قورئان وەکوو یەك کۆتایی نەهاتوون، چونکە هەندێك وشە بە پیتێکی بزوێن کۆتاییان هاتووە, هەندێکیش بەنابزوێن, هەروەها لە هەندێك وشەشدا پیتی کۆتایی نەنووسراوە, دیسان حەرەکەی کۆتایی هەموو وشەکان وەك یەك نین، بۆیە پێویستە قورئانخوێن بزانێت بە چ شێوەیەك لەسەر هەر وشەیەك دەوەستێت.

وشەکانی قورئان, بەم دوو جۆرە کۆتاییان هاتووە

تر- پیتێکی مەددە (بزوێن) (حرف علە)

یر- پیتێکی نەبزوێن (حرف صحیح)

تر- وەستان لەسەر وشەیەك, کە کۆتاییەکەی پیتێکی مەددە بێت: (ا ، و ، ي)

ئەگەر پیتی(مەددە) لە کۆتایی وشەکەدا نووسرابێت و لەسەریشی بوەستین, ئەوا پیتی مەددەکە دەخوێندرێتەوە، وەکوو:

﴿ فَأَسۡرِ بِعِبَادِي ﴾ (1)

﴿ وَلَوۡ سَمِعُواْ مَا ٱسۡتَجَابُواْ ﴾ (2)

﴿ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِي ﴾ (3)

ئەگەر بەهۆی (رەسمی) قورئان, یان بەهۆی شیکردنەوە (إعراب)ەوە, پیتی (مەددە) نەنووسرابێت, ئەوا پیتە مەددەکە ناخوێندرێتەوە، وەکوو:

﴿ يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ ﴾ (4) ﴿فَلِذَٰلِكَ فَٱدۡعُۖ﴾ (5)

﴿ فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخۡشَوۡنِ ﴾ (6)

بۆ زانین: لەم وشانەدا (يُحۡيِ, تُحۡيِ, أُحۡيِ, نُحۡيِ, يَسۡتَحۡيِ, لَمُحۡيِ, وَلِيِّ ), یائەکەی مەدد لە کۆتایی وشەکەدا نەنوسراوەتەوە, بەڵام لە حالەتی وەستان دا، دەخوێندرێتەوە، وەکوو: (يُحۡيِي, تُحۡيِي, وَلِيِّي... ), واتە: بەدوو (یاء) دەخوێندرێنەوە، کەچی لەحالەتی بەیەکگەیاندن دا، یائەکە دەسرێتەوە، ئەگەر پیتێکی ساکن بە دوایدا هاتبێت، وەکوو: ﴿كَيۡفَ تُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰۖ﴾.

---

( ) سورة الدخان : سمير (یر) سورة فاطر:شمتر (٣) سورة البقرة : بر لهتر

( ) سورة الزمر : تر ( ) سورة الشورى: لهتر (٦) سورة المائدة :شمشم

یر- وەستان لەسەر وشەیەك, كە كۆتاییەكەی پیتێكی نەبزوێن بێت

ئەگەر كۆتایی وشەكە, پیتێكی ساكنی ڕەسەن بێت, تەنیا بە سكون لەسەری دەوەستین، وەكوو:
﴿فَلَا تَنْهَرْ , فَٱنصَبْ , فَحَدِّثْ﴾

ئەگەر كۆتایی وشەكە, پیتێكی سەروژێر(متحرك) بێت, بە یەكێك لەم پێنج ڕێگایانە لەسەری دەوەستین:

- سكون (السُّكون)
- گۆڕین (الابدال)
- سڕینەوە (الحذف)
- كەمكردنەوەی دەنگی حەرەكە (الرَّوم)
- نیشانە بە لێوەكان (الإشمام)

یز- وەستان بە سکون (الوقف بالسُّکون): هەر وشەیەك, کۆتاییەکەی بەسەروژێر بێت (جگە لە دوو فەتحە)[1] , دروستە کە خوێنەر بە سکون لەسەری بوەستێت، وەکوو:
﴿ تَعۡمَلُونَ, هُوَ خَيۡرٌ ﴾ بە ﴿ تَعۡمَلُونۡ, هُوَ خَيۡرۡ ﴾ لەسەری دەوەستین
﴿ وَالفَجۡرِ, مِن قَبۡلُ ﴾ بە ﴿ وَالفَجۡرۡ, مِن قَبۡلۡ ﴾ لەسەری دەوەستین

یح- وەستان بە گۆڕین (الوقف بالابدال):
1- وەستان لەسەر وشەیەك, کە بە تائی خڕی رەگەزی مێ کۆتایی هاتبێت, ئەوا دەگۆڕدرێت بۆ هائێکی ساکن، وەکوو: ﴿ شَجَرَةً ﴾ ⟵ شَجَرَه ﴿ طَيِّبَةً ﴾ ⟵ طَيِّبَه ﴿
یط- وەستان لەسەر وشەیەك, کە کۆتایەکەی دوو فەتحە بێت, ئەوا دوو فەتحە دەگۆڕدرێن بۆ ئەلیف، وەکوو: ﴿ عَلِيمًا ﴾ ⟵ عَلِيما ﴿ مَاءً ﴾ ⟵ مَاءَا ﴿

ک- وەستان بە سڕینەوە (الوقف بالحذف): وەستان لەسەر وشەیەك, کە کۆتاییەکەی دوو کەسرەی لەژێر بێت, یان دوو بۆر(ضمَة)ی لەسەر بێت, ئەوا تەنوین دەسڕینەوە و بە سکون لەسەری دەوەستین، وەکوو:
﴿ مَعۡلُومَٰتٍ ، أَيَّامٍ ﴾ بە ﴿ مَعۡلُومَٰتۡ ، أَيَّامۡ ﴾ لەسەری دەوەستین
﴿ وَٰحِدٌ ، رَّحِيمٌ ﴾ بە ﴿ وَٰحِدۡ ، رَّحِيمۡ ﴾ لەسەری دەوەستین

کا- وەستان بەڕەوم (الرَّوم): وەستان لەسەر وشەیەك بە ڕەوم, ئەگەر کۆتاییەکەی کەسرە یان (ضمَة) بێت و ڕەسەنیش بن, یاخود دوو کەسرە یان دوو (ضمَة) بن، وەکوو:
﴿وطَهَّرَكِ، ٱلۡمَجِيدُ، جَنَّتٍ، أحدٌ ﴾
(ئەم جۆرە وەستانە لە لاپەڕەکانی داهاتوودا بە بەرفراوانی باس دەکرێت)

کب- وەستان بەئیشمام (الإشمام): وەستان لەسەر وشەیەك بە ئیشمام, تەنیا ئەوکاتە دەبێت, کە ئاخیرەکەی(ضمَة)یەکی ڕەسەنی لەسەر بێت یان دوو (ضمَة)بێت، وەکوو:
﴿نَسۡتَعِينُ، شَهِيدٌ, ٱلۡمَجِيدُ ﴾
(ئەم جۆرە وەستانە لە لاپەڕەکانی داهاتوودا بە بەرفراوانی باس دەکرێت)

---

[1] کاتێك لەسەر وشەیەك دەوەستین, کە کۆتاییەکەی دوو فەتحەی لەسەر بێت, ئەوا ئەو دوو فەتحەیە دەبن بە ئەلیف, بەڵام دوو فەتحە لەسەر تائی خڕ نابن بە ئەلیف، چونکە (تائی خڕ) لەکاتی وەستان دەبێتە هاء، بۆ زانیاریی زیاتر, بگەڕێوە بۆ لاپەڕە (...)ی بابەتی (مد العوض).

# ڕەوم و ئیشمام لە وەستاندا

**تر- ڕەوم (الرَّوم):** بریتییە لە کەمکردنوو و نزمکردنەوەی دەنگی حەرەکەی ڕەسەنی پیتەکە، ئەم یاسایە لەگەڵ کەسرە و (ضمة)دا دەخوێندرێتەوە.

**بۆزانین:** پێویستە هەموو ئەو یاسایانەی لەگەڵ بەیەکگەیاندنی ئایەتەکە دەخوێندرێنەوە, لەگەڵ (ڕەوم)یش بخوێندرێنەوە، **وەکوو:** (قەڵەوکرن و سووککردنی پیتەکان وخوێندنی (مد العارض)بە دوو حەرکە و نەخوێندنەوەی هەژان (قەلقەلە).

**ئیمامی سەمەنودی دەڵێت:**

الرَّوْمُ كَالوَصْلِ وتَتَبِعِ الأَلِفْ ... مَاقَبلَهَا وَالعَكسُ في الغُنِّ أُلِفْ [1]

| نموونة | ﴿نَسْتَعِينُ﴾ ﴿وَٱلْفَجْرِ﴾ ﴿يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ﴾ ﴿عَجِيبٌ﴾ |
|---|---|

کاتێك بە (ڕەوم) لەسەر وشەیەك دەوەستین, کە دوو (ضمَة)ی لەسەر بێت, یان دوو کەسرەی لەژێر بێت, حەرەکەیەك دەسڕینەوە, ئینجا ڕەوم دەدەینە حەرەکەی دووەم.

| نموونة | ﴿عَلِيمٌ﴾ ﴿خَيْرٌ﴾ ﴿مَسْجِدٍ﴾ ﴿لِيَوْمٍ﴾ |
|---|---|

( عَلِيمٌ ⟵ عَلِيمُ + ڕەوم ) ( مَسْجِدٍ ⟵ مَسْجِدِ + ڕەوم )

**ئیمامی جەزەری دەڵێت:**

وَحَاذِرِ الْوَقْفَ بِكُلِّ الحَرَكَهْ .... إِلاَّ إِذَا رُمْتَ فَبَعْضُ الحَرَكَهْ [2]
إِلاَّ بِفَتْحٍ أَوْ بِنَصْبٍ وَأَشِمّ .... إِشَارَةً بِالضَّمِّ فِي رَفْعٍ وَضَمّ

---

(1) لآلئ البيان في تجويد القرآن/بر تر
(2) المقدمة الجزرية/شمبر تر

یر- **ئیشمام:** بریتییە لە نیشانکردن بە لێو بۆ (ضمَّة), واتە ئیشمام لەگەڵ (ضمَّة) دەخوێندرێتەوە, ئەویش کە لەسەر وشەیەك دەوەستین, پیتی کۆتایی ((ضمَة)یەك یان دوو ضمَة))بێت, ئەوا دەکەین بە سکون و لەهەمان کاتدا لێوەکانمان بۆ خوێندنەوەی (ضمة) ئامادە دەکەین (خڕ دەکەینەوە)[1], بەڵام بەبێ ئەوەی دەنگی (ضمة)ی لێوە بێت.

هەر وشەیەك بەئیشمام لەسەری بوەستین, هەموو یاساییێکی وەستان لەگەڵی دەخوێندرێنەوە, وەکوو: (سووککردن، قەڵەوکردن، خوێندنی (مد العارض) بە (یر,شم, ) حەرکە، قەلقەلە)، وەکوو:

| | | |
|---|---|---|
| ﴿ عَلِيمٌ ﴾ | بە | ﴿ عَلِيمْ ﴾ + ئیشمام لەسەری دەوەستین |
| ﴿ٱلْمَجِيدُ﴾ | بە | ﴿ المَجِيدْ ﴾ + قەلقەلە + ئیشمام لەسەری دەوەستین |
| ﴿ نَسْتَعِينُ﴾ | بە | ﴿ نَسْتَعِينْ ﴾ + ئیشمام لەسەری دەوەستین |

**هۆکارەکانی وەستان بە ڕەوم و ئیشمام:**

تر- تاکوو حەرەکەی کۆتایی وشەکە دیار ببێت، ئاخۆ (ضمَّة) یان (کەسرە)یە, بە هۆی شیکردنەوە و واتا.

یر- کە بە سکون لەسەر وشەیەك دەوەستین و واتای ئەو وشەیە لە ڕەگەزی مێوە دەبێتە ڕەگەزی نێر, ئەوا باشتر وایە بە ڕەوم لەسەر ئەو وشەیە بوەستین، وەکوو:

﴿ يُبَشِّرُكِ ﴾ ﴿ٱصْطَفَىٰكِ﴾ ﴿ وَطَهَّرَكِ ﴾

سه- هەندێك وشە لە قورئاندا هەن, پیتی کۆتاییيان نەنووسراوە, بۆیە کە بە سکون لەسەری دەوەستین, پێویستە بەپێی ئەو وێنەیەی کە پێی نووسراوە لەسەری بوەستین، وەکوو:

یاء سڕاوەتەوە: ﴿ وَلِيَ دِينِ , ذَٰلِكَ مَاكُنَّا نَبْغِ , نُنجِ ٱلْمُؤْمِنِينَ , وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّاتِ , يَوْمَ يَأْتِ ﴾

(واو) سڕاوەتەوە: ﴿ يَمْحُ , سَنَدْعُ , صَالِحُ المُؤْمِنِينَ ﴾

بۆیە باشتر وایە بە (ڕەوم یان ئیشمام) لەسەر ئەم جۆرە وشانە بوەستین, چونکە وەستان بە سکون بەپێی وێنە ڕەسەنەکەی وشە ناخوێندرێتەوە, یاخود واتاکەی سەر لە مرۆڤ دەشێوێنێت, هەرچەند ئەگەر بەسکونیش بوەستین هەر دروستە, یاخود ئێمە دەتوانین لەسەر ئەو وشانە نەوەستین, کە کەوتوونەتە ناوەڕاستی ئایەتەکەوە.

شه- خوێندنەوە بە(ڕەوم و ئیشمام)ەکان, جۆرەکانی خوێندنەوە لە هەندێك وشەدا لێکجیا دەکەنەوە, وەکوو: (کُن فَيَكُونَ , کُن فَيَكُونُ) بە فەتحە و بۆر (ضمة) دەخوێندرێتەوە.

---

( ) المنح الفكرية: (ص ترسه)

## لەو شوێنانەی کە ڕەوم و ئیشمام لە وەستاندا ناخوێندرێنەوە

تر- هەر وشەیەك، کۆتایەکەی فەتحە بێت، بە (ڕەوم و ئیشمام) لەسەری ناوەستین، بەڵکوو تەنیا بەسکون لەسەری دەوەستین، چونکە دەنگی فەتحە وەك دەنگی (ضمة) و کەسرە، [1] کەم نابێتەوە، وەکوو:

﴿ يُبَشِّرُكَ ﴾ ﴿ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ ﴿ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾ ﴿ تَعۡلَمُونَ ﴾

یر- ئەگەر میمی کۆ لە کۆتایی وشە هاتبێت، بە هەندێك ڕیوایەت، سکونەکەی بە (ضمة) دەخوێندرێتەوە و درێژ دەبێتەوە بۆ (واو)، بەڵام بە حەرەکە ڕەسەنەکەی، بە(سکون) لەسەری دەوەستین، وەکوو:

﴿عَلَيۡهِمۡ﴾ ← ﴿عَلَيۡهِمۡ﴾ و ﴿ رَزَقۡنَٰهُمۡ ﴾ ← ﴿ رَزَقۡنَٰهُمۡ ﴾ و

سم- ئەگەر حەرەکەی کۆتایی وشەکە نارەسەن بێت، جا چ(ضَمَّة) بێت یان (كَسرَة) بێت، بە (ڕەوم و ئیشمام) لەسەری ناوەستین، وەکوو: وەستان لەسەر( أمِ ، قلِ ،عليهمُ) لەم ئایەتانە:

﴿ أَمِ ٱرۡتَابُوٓاْ ﴾ ﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ﴾ ﴿ عَلَيۡهِمُ ٱلۡعُمُرُۗ ﴾

ئەم حەرەکەیە بە هۆی بەدوای یەکداهاتنی دوو پیتی ساکن بۆ پیتەکە دانراوە، بۆیە لەکاتی وەستان، دەگەڕێینەوە سەر حەرەکە ڕەسەنەکەی خۆی، ئەویش سکونە.

شم- تائی خڕ، ئەوەی بۆ ڕەگەزی مێ دەنووسرێت لە کۆتایی وشە، بە(ڕەوم و ئیشمام) لەسەری ناوەستین، بەڵکوو بەتەنیا دەبێتە هائێکی ساکن، وەکوو:

﴿ خَلِيفَةٗۖ ← خَلِيفَه ﴾ ﴿ غِشَٰوَةٞۖ ← غِشَٰوَه ﴾ ﴿ بِٱلۡمَرۡحَمَةِ ← بِٱلۡمَرۡحَمَه ﴾

تێبینی: ئەگەر تائەکە کراوە بێت و (ضمَة)ی لەسەر بێت، یان کەسرەی لەژێر بێت، ئەوا دروستە بە (ڕەوم یان بە ئیشمام) لەسەری بوەستین، وەکوو: ﴿مَّعۡلُومَٰتٞۚ﴾ ﴿رَحۡمَتِ﴾ ﴿طَيِّبَٰتِ﴾

---

[1] المرشد في التجويد:(صنيشمسم) ؛ المنح الفكرية: (صتيترسمني‌ترسم)

لە- لەگەڵ تەنوینی کەسرە, بە (ڕەوم و ئیشمام) لەسەر ئەم دوو وشەیە ناوەستین:
﴿حِينَئِذٍ , يَوۡمَئِذٍ﴾ چونکە کەسرە لەم دوو وشەیەدا ڕەسەن نییە، ئەم وشەیە لەبنچینەدا بەم شێوازەیە:﴿حين إذۡ + نۡ﴾﴿يوم إذۡ + نۡ﴾, واتە کۆتایەکەیان ساکنە و دوای نونی تەنوین زیادکراوە, بۆیە دەبنە دوو ساکن لەدوای یەك, ساکنی یەکەم (پیتی ذال)حەرەکەکەی دەبێتە کەسرە، چونکە ئەم کەسرەیە ڕەسەن نییە, بۆیە تەنیا بە سکون لەسەری دەوەستین.

- هائی گەیاندن (هاء الصلة), بە دوو شێواز لەسەری دەوەستین, بەپێی بووچۆنی ئیمام جەزەری[1]:

## أ- وەستان بە سکون, واتە: بە ڕەوم ئیشمام لەسەری ناوەستین:

ت- ئەگەر پێش (هاء)ی (ضمَة)ی لەسەر, واوێکی مەددی بێت، وەکوو: ﴿ فَٱعۡبُدُوهُ ﴾ ,
یان (ضمَّة) لەپێش هاء هاتبێت، وەکوو: ﴿ قُلۡتُهُ ﴾

ی- ئەگەر پێش (هاء)ی کەسرەی لەژێرە یائێکی ساکن هاتبێت، وەکوو:
﴿ فَأَلۡقِيهِ ﴾ ﴿ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ ﴾ یان کەسرە لەپێش (هاء), هاتبێت، وەکوو: ﴿رَحۡمَةَ رَبِّهِۦٓ﴾

## ب - وەستان بە (ڕەوم یان بە ئیشمام یان بە سکون):

ئەگەر حەرەکەی (هاء) و حەرەکەی پێش (هاء)یش هاوڕەگەز نەبن, واتە ئەگەر پێش هاء, ئەلیف بێت، وەکوو: ﴿ وَمَا عَلَّمۡنَٰهُ ﴾
یان فەتحە بێت، وەکوو: ﴿عَلَّمَهُ﴾
یان سکونی ڕەسەن بێت، وەکوو: ﴿ أَوۡ بَدِّلۡهُۚ ﴾
لەم کاتەدا دروستە بە(سکون یان بەڕەوم یان بە ئیشمام) لەسەری بوەستین, ئەویش بەپێی حەرەکەی هاء, جا چ کەسرە بێت یان (ضمَة) بێت.

بو زانین: ئەم دوو وشەیە ﴿ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ﴾ و ﴿عَلَيۡهُ﴾, چونکە بە (ضَمَّة)نووسراون و پیتی پێش ئەویش لە ڕەگەزی خۆی نییە, بۆیە دەتوانین بە (ڕەوم یان بە ئیشمام یاخود بە سکون) لەسەری بوەستین.

---

(1) النشر في القراءات العشر ؛ المنح الفكرية: (صبربيرسه)

## نموونە لەسەر وەستانەکان بە(سکون و ڕەوم و ئیشمام)

| ژ | نموونە | جۆری پیتی کۆتایی | جۆرەکانی وەستان |
|---|---|---|---|
| 1 | فَٱهْجُرْ، فَحَدِّثْ،وَضُرِبَتْ | سکونی ڕەسەن | وەستان بە سکون |
| 2 | يَتَبَدَّلِ ، وَلَئِنِ ، وَقُلِ | کەسرەیەکی ناڕەسەنی لەژێرە | وەستان بە سکون |
| 3 | ٱلْعَٰلَمِينَ ، تَعْمَلُونَ ،كَلَّمَ | فەتحەی لەسەرە و پێش ئەویش پیتی مەددەیە | وەستان بە مەددە (مد العارض للسّكون) بە (□،□،□) حەرەکە |
| 4 | وَمَا قَتَلُوهُ ، فَٱعْبُدُوهُ | (ضمة) لەسەر هائەکەیە, پێش ئەویش واوێکی مەددەیە | وەستان بە مەددە (مد العارض للسّكون) بە (□،□،□)حەرەکە |
| 5 | أَبَاهُ ، ٱجْتَبَٰهُ | (ضمة) لەسەر هائە, پێش ئەویش ئەلیفە | وەستان بە مەددە بە (□،□،□)حەرەکە<br>وەستان بە ڕەوم لەگەڵ کێشانی ﭓ حەرەکە<br>وەستان بە ئیشمام لەگەڵ کێشانی (□،□،□) حەرەکە. |
| 6 | يُبَشِّرُكِ ، بِٱلْعَهْدِ | کەسرەیەکی ڕەسەنە | وەستان بە سکون<br>وەستان بە ڕەوم |
| 7 | خِزْيٌ، وَجَنَّتٌ , قَٰنِتٌ | دوو بۆر(ضمة) | وەستان بە سکون<br>وەستان بە ڕەوم<br>وەستان بە ئیشمام |
| 8 | بِكَلِمَٰتِ ، مُّسْتَقِيمٍ<br>ٱلْخَيْرَٰتِ ، وَلِيَ دِينِ | دوو کەسرە<br>کەسرەیەکی ڕەسەنە | وەستان بە مەددە بە (□،□،□)حەرەکە<br>وەستان بە ڕەوم لەگەڵ کێشانی ﭓ حەرەکە |
| 9 | يَشَآءُ ، ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ | (ضمة) لەسەر هەمزەیە (مد الواجب المتصل ومد العارض للسّكون)ی تێدایە. | وەستان بە مەددە بە (□،□،□)حەرەکە<br>وەستان بەڕەوم, لەگەڵ ﭿ ، ﭓ )حەرەکە<br>وەستان بە ئیشمام و بە ﭿ، □،□)حەرەکە |
| 10 | أَنۢبِئُونِي، وَبُشْرَىٰ ، ظَلَمُواْ | کۆتایەکەی, پیتی مەددەیە. | وەستان بە مەددی ئاسایی, بەدوو حەرەکە |
| 11 | شَيْءٍ ، رَأَوْهُ | پێش پیتی کۆتایی, پیتێکی نەرم (لین)ە. | وەستان بە مەددی نەرم (اللين) بە (□،□،□) حەرەکە وەستان بەڕەوم, لەگەڵ دوو حەرەکە - وشەی (رَأَوْهُ) وەستان بەئیشمام و بە ﭓ،ﭿ، □)حەرەکە, جگە لە ڕەوم و سکون |
| 12 | تُحْيِ, يَسْتَحْيِۦ , لَمُحْيِ | کۆتایەکەی, پیتی مەددەیە بەڵام نەنووسراوە. | وەستان بە مەددی ئاسایی, بەدوو حەرەکە |

# دەستپێکردنی خوێندنەوە (الإبتِداء)

**الإبتداء:** بریتییە لە دەستپێکردنی خوێندنەوەی قورئان, یان تەواوکردنی خوێندنەوە دوای وەستان لە ناوەڕاست یان کۆتایی ئایەتەکە.

جۆرەکانی دەستپێکردن

أ- دەستپێکردنی ئارەزوومەندانە (الابتداء الاختياري)

ب- دەستپێکردنی فەرمانپێکراو (الابتداء الاختباري)

تر- دەستپێکردنی حەقیقی (الابتداء الحقيقي)

2- دەستپێکردنی تەواوکەر (الابتداء الاضافي)

**– دەستپێکردنی حەقیقی (الابتداء الحقيقي):** دەستپێکردنی خوێندنەوە لە سەرەتا یان ناوەڕاستی سورەتەکە, کە پێش ئەو, هیچ ئایەتێکی نەخوێندبێتەوە, واتە کە قورئان لە سەرەتاوە بۆ خوێندنەوە دەکرێتەوە، ئا لەوکاتەدا پێویستە ئەم خاڵانە ڕەچاو بکەین:

**أ – خوێندنەوە لە سەرەتای سورەتەکە:** خوێندنەوەی (أعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ) و (بِّسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ), ئینجا سورەتەکە بخوێندرێتەوە, تەنیا دەستپێکی (سورة التوبة) نەبێت, چونکە بەبێ (بِّسۡمِ ٱللَّهِ) دابەزیوە.

**ب – خوێندنەوە لە ناوەڕاستی سورەتەکە:**

تر- پێویستە ئەو ئایەتەی کە دەخوێندرێتەوە, نەبەشیکردنەوە (إعراب), نەبەواتاش, وابەستەی ئایەتی پێش خۆی نەبێت, یاخود پێویستە لە ئایەتی پێش خۆی دەست بە خوێندنەوە بکات.

یر- پێویستە خوێنەر (إستعاذ)ە بە ناو و سیفەتەکانی پەروەردگارەوە نەبەستێتەوە، وەکوو: ﴿أعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ﴾ پاشان ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن طِينٍ﴾(الانعام:یر) بخوێنێتەوە.

سم- پێویستە خوێنەر (بسم الله), بە ناو و سیفەتی و کارەکانی شەیتان و دووڕوو و کافرەکانەوە نەبەستێتەوە، وەکوو ئایەتی: ﴿إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوۡلِيَآءَهُۥ﴾(آل عمران:لهيتر)

**2- دەستپێكردنی تەواوكەر(الابتداء الاضافي):** بۆیە ئەم جۆرە دەستپێكردنە, بە تەواوكەر ناونراوە, چونكە خوێنەر دەست بە خوێندنەوەی تەواوی ئایەتەكە دەكات, یاخود دەست بە خوێندنەوەی ئەو ئایەتە دەكات كە بەدوایدا دێت لە هەمان دانیشتندا.

**جۆرەكانی دەستپێكردنی تەواوكەر**
**(الابتداء الاختیاري الاضافي)**

- ترـ الابتداء التام
- یرـ الابتداء الكافي
- سمـ الابتداء الحسن
- شمـ الابتداء القبیح

**ترـ دەستپێكردنی تەواو (الإبتداء التام):** بریتییە لە دەستپێكردنی خوێندنەوە, لە سەرەتای سورەتەوە یان سەری ئایەتەكە یاخود لە ناوەڕاستی ئایەتەكە، بەلام بەمەرجێك, واتا و شیكردنەوەی ئایەتەكە تەواو بێت و وابەستەی پێش خۆی نەبێت، ئەگەر ئەم دەستپێكردنە لە ناوەڕاستی ئایەتەكە بێت, دەكەوێتە دواى نیشانەی (مـ، قلے)، نموونە:

﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣﴾
﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ٢٨﴾ (1)

**یرـ دەستپێكردنی كافی (الابتداء الكافي):** بریتییە لە دەستپێكردنی خوێندنەوە, لە سەرەتا یان ناوەڕاستی ئایەتێك، كە بە واتا, وابەستەی پێش خۆی بێت, نەك بەشیكردنەوە (إعراب)، ئەگەر ئەم دەستپێكردنە لە ناوەڕاستی ئایەتەكە بێت, دەكەوێتە دواى نیشانەی (ج، صلے)، نموونە:

﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞۖ ٦﴾ (2)
﴿قَالُواْ ٱطَّيَّرۡنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَۚ قَالَ طَٰٓئِرُكُمۡ عِندَ ٱللَّهِۖ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ تُفۡتَنُونَ ٤٧﴾ (3)

---

(1) سورة الرعدتيير (2) سورة البقرةبي (3) سورة النمل :تيشم

**سم- دەستپێکردنی باش (الابتداء الحسن):** بریتییە لە دەستپێکردنی خوێندنەوە, لە سەرەتای ئایەتێك, کە بە واتا و شیکردنەوە (إعراب) وابەستەی ئایەتی پێش خۆی بێت، بەڵام دەستپێکردنی تەواوکەر بێت و هیچ واتایەکی هەڵە نەبەخشێت, بەڵام نابێت لە ناوەڕاستی ئایەتێك دەست بە خوێندنەوە بکرێت, کە بەواتا و شیکردنەوە, وابەستەی پێش خۆی بێت, ئا لەوکاتەدا, پێویستە چەند وشەیەك بگەڕێینەوە پێش ئەو, تا واتایەکی دروست دەبەخشێت, ئینجا پێکەوە ببەستینەوە.

**نموونە لەسەر دەستپێکردن لە سەرەتای ئایەتەکە, بەڵام بەیەکگەیاندن دروستترە:**

﴿ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴾ وەستان ﴿ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْأَخِرَةِۗ ﴾ (البقرة :ئيتريز- بريرير)

﴿ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾ وەستان ﴿ بِنَصْرِ ٱللَّهِ ﴾ (الروم:شم-لە)

هەندێك جار وەستان لەسەر وشەیەك ناشیرینە, بەڵام دەستپێکردن لەهەمان وشە دروستە,(1) وەکوو وشەی (هَٰذَا) لەم ئایەتەدا:
﴿ قَالُواْ يَٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَاۜۗ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ ٥٢ ﴾ (يس:ير لە)

هەندێك جاریش وەستان لەسەر وشەیەك باشە, بەڵام دەستپێکردن لە هەمان وشە ناشیرینە,(2) وەکوو وشەی (وَإِيَّاكُمْ) لەم ئایەتە: ﴿يُخْرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمْ﴾ (الممتحنة:تر)

**شم- دەستپێکردنی ناشیرین (الأبتداء القبيح):** بریتییە لە دەستپێکردن لە ئایەتێك یان وشەیەك, کە بە واتا و شیکردنەوە، وابەستەی پێش خۆی بێت, وەکوو دەستپێکردن بەم شێوازانەی خوارەوە:

أ- دەستپێکردنی خوێندنەوە لە شوێنێکی ئایەتەکە, کە هیچ واتایەك نەبەخشێت، ئەم دەستپێکردنە زۆرجار دوای وەستانی باش (الوقف الحسن) دێت, یان دوای نیشانەی (لا) دێت، وەکوو:

دەستپێکردنی خوێندنەوە لە ﴿ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ دوای وەستان لەسەر ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾

﴿ وَٱلَّذِي جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓۙ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾ (الزمرسمسم)

دەستپێکردنی خوێندنەوە لە ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ دوای وەستان لەسەر ﴿ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ﴾

(1) (یر) الاتقان في علوم القرآن:(صيريتيتر)

ب – دەستپێکردنی خوێندنەوە لە شوێنێکی ئایەتەکە, کە ئەو واتایە نابەخشێت کە پەروەردگار دەیەوێت, یان واتای کوفر دەبەخشێت, وەکوو:

دەستپێکردنی خوێندنەوە لە وشەی(لَن) لەم ئایەتەدا:

﴿وَقَالُواْ لَن يَدۡخُلَ ٱلۡجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰۗ﴾ (البقرة : ١١١)

دەستپێکردن لە وشەی ( مِّثۡلُكُمۡ ) دوای وەستان لەسەر وشەی (بَشَرٞ), لەم ئایەتەدا:

﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ﴾ (الكهف:١١٠)

دەستپێکردنی خوێندنەوە لە (إِنَّ ٱللَّهَ) لەم ئایەتەدا:

﴿لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ﴾ (المائدة:١٧)

ج- دەستپێکردنی خوێندنەوە لە بەرایی ئایەتێك, کە ئەو واتایە نەبەخشێت, کە پەروەردگار دەیەوێت, یاخود واتای کوفر دەبەخشێت, وەکوو:

﴿٣٠ نَحۡنُ أَوۡلِيَآؤُكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ﴾ (فصلت: ٣١)

﴿151 وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ١٥٢﴾ (الصافات)

## دەستپێکردنی فەرمانپێکراو( الابتداء الاختباري )

دەستپێکردنی خوێندنەوە, بە فەرمانی مامۆستا, بەمەبەستی تاقیکردنەوە, وەکوو: دەستپێکردنی خوێندنەوە لە هەمزەی گەیاندن ﴿ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ﴾ (الاعراف:٥٥) تاکوو قوتابی بزانێت بەچ حەرەکەیەك دەست بەخوێندنەوە دەکات, یاخود لە وشەیەکەوە کە بە دوو هەمزە دەستپێدەکرێت, وەکوو: ﴿ٱئۡتُونِي بِكِتَٰبٖ﴾ (الاحقاف:٤) تاکوو بزانێت هەردوو هەمزەکە چۆن دەخوێندرێنەوە, یاخود چۆنیەتی خوێندنەوەی ئەو وشانەی کە بە دوو شێوە دەخوێندرێنەوە, وەکوو وشەی ﴿ٱلِاسۡمُ﴾.

## پیته پچڕاو و گەیەندراوەکان (المقطوع والموصول)

هەندێك وشە لە قورئانی پیرۆزدا لێکجیا نووسراون, هەندێك جاریش هەمان وشە پێکەوە نووسراون، ئەوکاتەی کە بەجیا نووسراون, دروستە بەجیا لەسەر وشەی یەکەم بوەستین, یاخود لەسەر وشەی یەکەم و دووەم بوەستین، بەڵام وەستانێکی فەرمانپێکراو (الوقف الاختباري) یان وەستانێکی ناچاری (الوقف الاضطراري)،
بەڵام ئەوکاتەی کە پێکەوە نووسراونەتەوە, نابێت خوێنەر لێکیان جیا بکاتەوە و لەسەر وشەی یەکەم بوەستێت, بەڵکوو تەنیا لەسەری وشەی گەیەندراو دەوەستێت.

ئیمامی جەزەری خودا لێی ڕازی بێت, ئاماژەی بەم بابەتە داوە, هەروەك دەڵێت:

وَمَا الذِي رُسِّمَ فِي المَصَاحِفِ ........
مِنْ كُلِ مَقْطُوعٍ وَمَوْصُولٍ بِها ....... وَتَاءِ أُنثَىٰ لَم تَكُنْ تُكْتَبَ بِها (1)

هەروەها دەڵێت:

وَاعرِفْ لِمَقْطُوعٍ وَمَوْصُولٍ وَتَا ..... فِي مُصْحَفِ الإمامِ فِيمَا قَدْ أَتَى (2)

وشە جوداکان لە قورئانی پیرۆزدا, بەم شێوەیە نووسراون:

﴿ أن لَّا , عَن مَّا , فِي مَا , مِن مَّا , أَم مَّن , إِنَّ مَا , أَنَّ مَا , كُلَّ مَا ,
بِئسَ مَا , أَينَ مَا , إِن لَّم , أَن لَّن , كَي لَا , عَن مَّا , قَالَ ٱبنَ أُمَّ ﴾

وەکوو:

﴿مِن مَّا مَلَكَتۡ﴾ ﴿أَن لَّآ أَقُولَ﴾ ﴿كَيۡ لَا يَكُونَ﴾ ﴿عَن مَّا نُهُواْ﴾

هەمان وشە لە قورئاندا پێکەوە نووسراوەتەوە, بەم شێوەیەی خوارەوە:

﴿ أَلَّا , (عَمَّا , عَمَّ) , (فِيمَا , فِيمَ ) , (مِمَّا , مِمَّ) , أَمَّن , إِنَّمَا , أَنَّمَا , كُلَّمَا , بِئسَمَا , أَينَمَا , إِلَّم , أَلَّن , كَيلَا , عَمَّا , قَالَ يَبْنَؤُمَّ ﴾

وەکوو:

﴿مِمَّا مَلَكَتْ ﴾ ﴿ فِيمَ أَنتَ ﴾ ﴿ فِيمَا كَانُوا ﴾ ﴿ أَلَّا تَخَافُوا ﴾

زانیاری

وشەی ﴿ إِلْ يَاسِينَ ﴾, ( إِلْ ) بەجیا و ( يَاسِينَ ) بەجیا نوسراوە لێکجیا نووسراون، بەڵام دروست نییە لەسەر(إِلْ) بوەستین و لە وشەی (يَاسِينَ) جیای بکەینەوە، چونکە ئەم دوو وشەیە بە وشەیەك هەژمار دەکرێن.

وشەی ﴿ءَالَ فِرْعَوْنَ﴾ دروستە لەسەر(ءآلَ) بوەستین, بەڵام وەستانێکی بەناچاری (وقف اضطراري ) یان وەستانێکی فەرمانپێکراو(وقف اختباري), ئینجا دەبێت بگەڕێینەوە و پێکەوە بیان بەستینەوە, تاکوو ئایەتەکە واتایەکی تەواو ببەخشێت.

# تەكبیر كردن لەگەڵ قورئان خوێندنەوە( التكبير )

**التكبير:** بریتییە لە وتنی وشەی (الله اكبر) .[1]

تەكبیر كردن بەڕێگای(شاطبي), بەتەنیا لە قیرائەتی ئیمام (ابن كثير)دا دەخوێندرێتەوە, ئەویش لە كۆتایی(سورة الضحى), تا سەرەتای (سورة الناس), واتە لە ڕیوایەتی (حفص)دا بەڕێگای(شاطبي)تەكبیر كردن نابێت, جا چ تەكبیری گشتی بێت, یان تەكبیری تایبەت (لەگەڵ سورەتە كورتەكان),[2] بەڵام بەڕێگای (طيبةالنشر)تەكبیركردن دروستە.

(الشيخ علي الضباع )(خودا لێی ڕازی بێت), دیاری كردووە لە كوێ تەكبیر بكرێت، دەڵێت:

مِنْ أَوَّلِ انْشِرَاحِهَا أَوْ مِنْ فَحَدْ ..... دِثْ خُلْفُ تَكْبِيرٍ لِحَفْصٍ قَدْ وَرَدْ

وَبَعْضُهُمْ كَبَّرَ فِي غَيْرِ بَرَا ..... ءَةٍ وَتَرْكُهُ لِجُمْهُورٍ جَرَى[3]

**نموونة**

بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ **الله اكبرُ** بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ

ير- وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرْغَب **الله اكبرُ** بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيْتُونِ

- وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ **الله اكبرُ** بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ

---

(تر) هەندێك زانا دەڵێن بەم دوو ڕێگایە تەكبیر كردن دروستە, وەكوو (ابن مجاهد) خودا لێی ڕازی بێت دەڵێت:

تر- لا اله الأ الله والله اكبر    ير- لا اله الأ الله والله اكبر ولله الحمد

(ير) زانایانی قیرائەتەكانیش, سێ بووچۆنیان هەیە بۆ تەكبیر كردن ( – تەكبیری تایبەت لە سەرەتای (سورة الانشراح) تا سەرەتای (سورةالناس) ير- تەكبیری تایبەت لە كۆتایی (سورة الضحى) تا كۆتایی (سورة الناس)، – تەكبیری گشتی واتە لە سەرەتای هەموو سورەتەكان, جگە لە(سورة التوبة) چونكە (بسم الله)ی تێدا نییە.

(سم) الفوائد المهذبة / ،

×× فەرموودەیەك بۆ ئێمە ڕیوایەتكراوە لە (الحاكم أبو عبدالله)وە, لە(المستدرك)دا, لە ئیمام(أحمد بن محمد البزى) گوازراوەتەوە لە زۆر ڕیوایەتدا, كە پێویستە لە كۆتایی (سورة الضحى) هەتا كۆتایی سورة الناس) تەكبیر بخوێندرێتەوە, هۆكاری خوێندنەوە و تەكبیر كردنیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە, هەرووك زۆربەی شیكەرەوە و زانایانی قیرائەتەكان فەرموویانە, دوای تاخیربوونی نیگا (وەحی) بۆ پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، بۆ ماوەی (برشم) ڕۆژ, بێباوەڕەكان وتیان: پەروەردگار پەیوەندیی خۆی لەگەڵ محەمەد (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پچڕاندووە، بەڵام دواتر پەروەردگار (سورة الضحى)ی بۆ پێغەمبەر دابەزاند و جبریل (عَلَيْهِ السَّلَامُ) لە خۆشییا وتی:(الله اكبر)و بۆ پێغەمبەریش خوێندییەوە و ئەویش وتی:(الله اكبر), لە خۆشی و بەمەبەستی دوورخستنەوەی بێباوەڕەكان, بۆیە لە (سورة الضحى) تا كۆتایی (سورة الناس) تەكبیر دەخوێندرێتەوە و دەكرێت, بۆ ئەوەی ئێمەش لە خۆشی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جبریل (عَلَيْهِ السَّلَامُ) بەژدار بین.

## جیاوازیی لە نێوان ( شاطبية ) و ( طيِّبة )

جۆرەکانی خوێندنەوە, کە پێی دەڵێن(القراءات), ئەوانەی کە قورئانی پێ دەخوێندرێتەوە بە دوو ڕێگای بە ئێمە گەیشتووە, کە پێی دەڵێن: (ڕێگای (شاطبي) و ڕێگای (طيِّبة)):

١- الشّاطبية: بریتییە لە حەوت جۆری خوێندنەوە, کە زانای بەناوبانگ أحمد بن موسى بن مجاهد البغدادی(لهشميره – شميرسمه) لە کتێبێکدا, بەناوی(السّبعة في القراءات) کۆیکردۆتەوە و پاشان (أبو عمر الداني تشمشمشمه) کتێبی (التيسير)ی لەسەر نووسیوە و ئیمام (شاطبي تيهسلهه)[1] بە شیعر شیکردۆتەوە لەگەڵ زیادەکانی و ناوی ئەو شیعرەی کردووە بە (حرز الاماني ووجه التهاني) کە بە (متن الشاطبية) بەناوبانگە، بۆ هەریەك لەو حەوت جۆرە خوێندنەوەیەش, دوو ریوایەت هەڵبژێردراون, بۆ هەر ریوایەتێکیش ڕێگایەك هەڵبژێردراوە, تا دەگاتە (عبيد بن الصباح), کە یەکێکە لەو زانایانەی کە قورئانی لای ئیمام (حفص) خوێندووە و بۆ ئێمەشی گواستووەتەوە.

٢-دە جۆری خوێندنەوە بەڕێگای (شَاطِبِي و دُرَّة):حەوت جۆر خوێندنەوەی(شاطبي) لەخۆ دەگرێت, لەگەڵ سێ جۆری( الدُّرَّة), کە ئیمام جەزەری لەسەر شاطبي زیاد کردوون و بۆ هەر خوێندنێکیش دوو ڕیوایەتی هەڵبژاردووە و بۆ هەر ڕیوایەتێکیش ڕێگایەکی هەڵبژاردووە.

٣- دە جۆری خوێندنەوە بەڕێگای (الطيبة): دە جۆرە خوێندنەوەن, (ئیمام جەزەری)[2] بە شیعر و بەدوورو درێژی قسەی لەسەر کردووە، ئەم دە جۆرە, حەوت جۆری (شاطبي) لەخۆ دەگرێت, لەگەڵ هەرسێ جۆری (الدُّرَّة), بۆ هەر جۆرەك لەم دە جۆرانە, دوو ڕیوایەت هەن، بەڵام بۆ هەر ڕیوایەتێك دوو ڕێگا هەن و بۆ هەر ڕێگایەکیش, دوو ڕێگای دیکە هەن, واتە بۆ هەر دە جۆری خوێندنەوە, هەشتا ڕێگا هەن و بەم جۆرە زیاد دەبن.

---

( ١) ناوی (القاسم بن خلف بن أحمد بن فيرُه الشاطبي)یە, ناسراوە بە(ئیمام شاطبي), لە ساڵی تيهسلهك, لە شاری(شاطبة)
لە ڕۆژهەڵاتی (ئەندەلوس) هاتووەتە دونیاوە, لە ساڵیبرنی لهك, لە شاری(قاهرة) کۆچی دوایی کردووە.

( ٢) ناوی (محمد بن محمد بن محمد بن علي بن يوسف الجزري)یە, ناسراوە بە(ئیمام جەزەری) لە کوردانی جەزیرەی بۆتانە لە ( باکووری کوردستان)، لە ساڵیسملهك لە شاری (دمشق) لە دایك بووە و لە ساڵیسمستیك لە شاری (شیراز)ی
وڵاتی ئێران کۆچی دوایی کردووە.

×× لە زۆربەی جیهان وا باوە, ئەو دە جۆرەی بەڕێگای (شاطبي و درَّة)دەخوێندرێنەوە, پێی دەڵێن: (القراءات العشر الصغرى), هەروەها ئەو دە جۆرەی بەڕێگای (طيبة)ش دەخوێندرێنەوە, پێی دەڵێن: (القراءات العشر الكبرى).

جیاوازیی لە نێوان ڕێگای (شاطبي) و ڕێگای (طيبة) لە ڕوایەتی (حفص)دا

ئ- جیاوازیی لە بنچینەدا (الاختلاف في الاصول)

ب- جیاوازیی لە وشەدا (فرش الكلمات)

ئ- جیاوازیی لە نێوان ( شاطبية ) و ( طيبة ) لە بنچینە (في الاصول) دا

| ژ | لەو شوێنانەی کە جیاواز دەخوێندرێنەوە | ڕێگای ( شاطبية ) | ڕێگای ( طيبة ) |
|---|---|---|---|
| 1 | خوێندنەوەی تەکبیر (الله اكبر) | تەکبیر ناخوێندرێتەوە | دروستە تەکبیر بخوێندرێتەوە و بکرێت |
| 2 | ئیدغامی نون لەگەڵ پیتەکانی(ل ، ر) | ئیدغام بەبێ مینگە (بلاغنة ) | ئیدغام بەمینکە وبەبێ مینگە (إدغام بغنة وبلا غنة) |
| 3 | پیتی ساکن لەپێش هەمزە، وەکوو: (يَسْأَلُ) | پێکەوە دەخوێندرێنەوە، بەبێ(سەکتە) | بە (سەکتە) لەسەر ساکنی پێش هەمزە دەوەستین وەك (يَسْ أَل) |
| 4 | مەددی پێویست و بەیەکگەیشتوو (المد الواجب المتصل) | بە (شم ، لە) حەرەکە درێژ دەکرێتەوە | بە (شم ، لە ، ) حەرەکە درێژ دەکرێتەوە |
| | مەددی شیاوی پچڕاو (المد الجائز المنفصل) | بە (شم، لە) حەرەکە درێژ دەکرێتەوە | بە ( ب،سە،شم ، لە) حەرەکە درێژدەکرێتەوە |

زانیاری

یاسای هەیە، وەکوو:

- لە ڕیوایەتی ئیمام (حفص)دا، دروست نییە (وەستان لەسەر ساکنی پێش هەمزە و ئیدغامی نون لەگەڵ (ل، ر) بەغوننە) پێکەوە بخوێندرێنەوە، وەکوو: وشەی(مَسْؤُلًا) لەگەڵ غوننەی (مِن لَّدُنْهُ) (مِن رَّبِهِم).

- هەروەها بۆ بنچینەکانی دیکەش، هەندێك یاسا و بنەما هەن، کاتێك پێکەوە دەخوێندرێنەوە.

## ێر- جیاوازیی لە نێوان (شاطبية) و (طيِّبة) لە خوێندنەوەی وشەکاندا (فرش الكلمات)

| ژ | لەو شوێنانەی بە جیاواز دەخوێندرێنەوە | خوێندنەوە بە (شاطبية) | خوێندنەوە بە (طيبة) |
|---|---|---|---|
| 1 | ﴿وَٱللَّهُ يَقۡبِضُ وَيَبۡصُۜطُ﴾البقرة لهُمیر ﴿وَزَادَكُمۡ فِي ٱلۡخَلۡقِ بَصۜۡطَةٗ﴾(الاعراف-بيّ) | بە سین دەخوێندرێنەوە (يبسط ، بسطة) | خوێندنەوە بە سین(يبسط، بسطة)یان بەصاد(يبصط،بصطة) |
| 2 | ﴿لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ﴾ (الغاشية-يرير) | بە صاد (بِمُصَيۡطِرٍ) دەخوێندرێتەوە | خوێندنەوە بە سین (بمسيطر) یان خوێندنەوە بە صاد(بمصيطر) |
| 3 | ﴿ أَمۡ هُمُ ٱلۡمُصَيۡطِرُونَ ﴾ (الگور-سە) | دروستە بە سین بخوێنینەوە, بەڵام بە صاد باشترە | خوێندنەوە بە سین (المسيطرون) یان بە صاد (المصيطرون) |
| 4 | ﴿يَلۡهَثۚ ذَّٰلِكَ ﴾ (الاعراف بيتر) ﴿يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا ﴾ (هود -يرشە) | بە ئیدغام دەخوێندرێنەوە | بە ئیدغام و(اظهار) دەخوێندرێنەوە |
| 5 | ﴿يسٓ ١ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ﴾ (يس) ﴿نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ﴾ (القلم) | بە(اظهار)ی دەخوێندرێنەوە | بە (اظهار) و ئیدغام دەخوێندرێنەوە |
| 6 | ﴿وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ١ قَيِّمٗا﴾ (الكهف ﴿مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرۡقَدِنَاۜۗ هَٰذَا ﴾يس-يرلە ﴿وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ ﴾ (القيامە-ير ) ﴿كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ ﴾ (المطففينشمتر) | کاتی بەیەکگەیاندن, بە (سەکتە) دەخوێندرێنەوە | کاتی بەیەکگەیاندن, بە سەکتە یان بەبێ(سەکتە)دەخوێندرێنەوە |
| 7 | یائی (ي), لە خوێندنەوەی پیتی (عين) لە سورة (الشورى ، مريم) | بە مەددی (شە ، ) حەرەکە درێژ دەکرێتەوە | بە مەددی ( ير ،شە ، ) حەرەکە درێژ دەکرێتەوە |
| 8 | ﴿ضَعۡفٖ﴾ ﴿ ضَعۡفٗا ﴾ (الرومشەلە) | بەفەتحە دەخوێندرێتەوە وەك ﴿ضَعۡفٖ﴾ یان بە(ضمة) وەك ﴿ضُعۡفٖ﴾ | بە فەتحە دەخوێندرێنەوە ﴿ضَعۡفٖ﴾ ﴿ ضَعۡفٗا ﴾ |
| 9 | ﴿سَلَٰسِلَاْ﴾ (الانسان شە) | وەستانی بە سکون (سَلَٰسِلۡ)یان ئەلیف(سَلَٰسِلَا) | وەستانی بە سکون (سَلَٰسِلۡ) |
| 10 | ئیدغامی نون لەگەڵ (ل, ر) ﴿مِن لَّدُنۡهُ , مِن رَّبِّهِمۡ﴾ | خوێندنەوە بە ئیدغامی تەواو و بێ غوننە | خوێندنەوە بە ئیدغامی تەواو بەغوننە و بێ غەننە |

## یاساکانی کورتکردنەوەی (المد الجائز المنفصل ) بۆ دوو حەرەکە

کورتکردنەوەی مەددی شیاوی پچڕاو بە یەکێك لە ڕێگاکانی(طیبة النشر), بە ڕێگای (الحمامی) لە (الولی) لە (الفیل) لە (عمرو بن الصباح) لە (حفص بن سلیمان), هەروەك لە کتێبی (المصباح )[1] دا هاتووە, کە ئەم ڕێگایە نزیکترین ڕێگایە لە ڕێگاکانی (طیبة النَّشر), بۆ ڕێگای (شاطبي)، بەڵام بۆ کورتکردنەوەی مەددی لێکجیا بۆ دوو حەرەکە, پێویستە ئەم گۆڕینانە ڕەچاو بکەین:

تر- خوێندنەوەی مەددی شیاوی پچڕاو بە دوو حەرەکە، وەکوو: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ﴾ ﴿ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا﴾.

یر-خوێندنەوەی مەددی بەیەکگەیشتوو(المدالمتصل) بەچوار حەرەکە، وەکوو: ﴿ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ﴾.

سە- خوێندنەوەی هەردوو وشەی ﴿ وَيَبۡصُۜطُ﴾ (البقرة: لهثمیر) ، ﴿ بَصۜۡطَةٗۖ ﴾ (الاعراف:ني) بە صاد.

شە- پێویستە وشەی ﴿ٱلۡمُصَيۡطِرُونَ﴾(الطوربیهم) بە سین بخوێندرێتەوە لە شوێنی صاد(ٱلۡمُسَيۡطِرُونَ).

-پێویستە وشەکانی ﴿ ضَعۡفٖ ﴾ ﴿ ضَعۡفٗا ﴾ (الروم:شەلە) فەتحە لەسەر (ضَ) بخوێنین.

-پێویستە هەمزەی گەیاندن لەم سێ وشانەدا, بە شەش حەرەکە درێژ بکرێتەوە:

﴿ءَآللَّهُ ﴾﴿ءَآلۡـَٰٔنَ ﴾﴿ءَآلذَّكَرَيۡنِ﴾واتە: بە مەددە دەخوێندرێنەوە, نەك بە ئاسانکردن(تسهیل).

- خوێندنی وشەی ﴿ تَأۡمَ۫نَّا ﴾ (یوسف: ترتر) بە ئیشمام.

تی- درێژکردنەوەی مەددە لەگەڵ پیتی(ع), لە هەردوو سورەتی(مریم والشورى)دا, بە چوارحەرەکە.

- تەکبیر کردن یان نەکردن لە کۆتایی سورەتی (الضحى), تا کۆتایی سورەتی (الناس) دروستە.

یر- پێویستە پیتی (ر)لە وشەی ﴿ فِرۡقٖ ﴾(الشعراءسە)دا, لەکاتی بەیەکگەیاندن بە قەڵەوی بخوێندرێتەوە.

- وەستان لەسەر وشەی ﴿ ءَاتَىٰنِۦَ ﴾(النمل: سە) بە سکون لەسەر نون دەوەستین ﴿ ءَاتَىٰنۡ ﴾

یر- وەستان لەسەر وشەی ﴿ سَلَٰسِلَاْ ﴾ (الانسانشە) بە سکون لەسەر لامی کۆتایی (سَلَٰسِلۡ).

---

[1] المصباح الزاهر في القراءات العشر البواهر/أبي الكرم الشهرزوري

# نیشانەکانی تەجوید لە قورئاندا

| | | |
|---|---|---|
| 1 | ۘ | نیشانەی وەستانی پێویست (پێویستە خوێنەر لێرە بوەستێت) (الوقف اللازم) |
| 2 | ۗ | وەستان لای ئەم نیشانە باشترە, دروستیشە نەوەستین (الوقف التام). |
| 3 | ۚ | دروستە خوێنەر لای ئەم نیشانە بوەستێت, یاخود نەوەستێت (الوقف الجائز المستوي الطرفين). |
| 4 | ۖ | نیشانەی وەستانە, بەڵام بەیەکگەیاندنی ئایەتەکە باشترە (الوصل اولى). |
| 5 | ∴ ∴ | نیشانەی دوو شوێنی وەستانە بەدوای یەکدا (وقف المعانقة) |
| 6 | ۙ | دروست نییە خوێنەر لای ئەم نیشانە بوەستێت (امتناع الوقف). |
| 7 | ۦ ۥ | نیشانەی درێژکردنەوەی کەسرەی لەژێر (ە ، ـە)ە, تاکوو دەبێتە (یاء), هەروەها درێژکردنەوەی بۆر(ضمة) لەسەر هاء, تاکوو دەبێتە(واو), کە پێی دەڵێن: (مد الصلة), ( وَلَقَدۡ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ فَٱسۡتَعۡصَمَ ) |
| 8 | ۧ | پیتی (یاء) بەپێی وێنە باوەکەی خۆی, نەنووسراوە, بەڵام بە یاء دەخوێندرێتەوە, وەکوو : ﴿ يحۡيِۦ ، إِۦلَٰفِهِمۡ ، إِبۡرَٰهِمۧ ﴾ |
| 9 | ٓ | نیشانەی درێژکردنەوەی پیتی مەددەیە (ا ، و ، ي), (ٱلسَّمَآءُ , سُوٓءِ ) |
| 10 | ّ شەددە | نیشانەی پیتی قورسە, واتە ئەم پیتە لە دوو پیت پێکهاتووە, پیتێکی ساکن و پیتێکیش بەسەروژێرە. |
| 11 | ◊ | ئەگەر ئەم نیشانە لەسەر پیتەکە بێت, ئەوا ئەو پیتە بە ئیشمام دەخوێندرێتەوە, وەکوو وشەی: ﴿ تَأۡمَ۫نَّا ﴾ بەڵام ئەگەر لەژێر پیتەکە بێت, ئەوا بە لارکردنەوەی ئەلیف دەخوێندرێتەوە, وەکوو وشەی: ﴿ مَجۡر۪ىٰهَا ﴾. |
| 12 | ۜ | ئەگەر پیتی(س)ی بچووك لەسەر پیتی(ص) نووسرابێت, بە(س)دەخوێندرێتەوە لەجیاتی(ص), وەکوو : ﴿ بَصۜۡطَةٗ ﴾، بەڵام ئەگەر (س) لەژێر (ص) بێت, ئەوا بە (ص) دەخوێندرێتەوە, وەکوو: ﴿ ٱلۡمُصَۣيۡطِرُونَ ﴾, هەروەها ئەگەر لە نێوان دوو وشەدا بێت, نیشانەی سەکتەیە (وەستانی کورت)ە, وەکوو: ﴿ وَقِيلَ مَنۜۡ رَاقٖ ﴾ |

| | | |
|---|---|---|
| 13 | ٱ | ئەلیفی بەیەکگەیاندن لە سەرەتای ئەو وشانە نووسراوە, کە بە سکون دەستیان پێکردووە، وەکوو: ﴿ ٱهۡبِطُواْ ﴾ ﴿ ٱقۡتَرَبَتِ ﴾ ﴿ ٱدۡعُواْ ﴾ |
| 14 | أ | ئەگەر بازنەیەکی وەکوو هێلکە لەسەر ئەلیف بێت, واتە لەکاتی بەیەکگەیاندن, ئەلیفەکە ناخوێندرێتەوە، بەڵام لەکاتی وەستان دەخوێندرێتەوە، وەکوو: ﴿ لَّٰكِنَّا ﴾ ﴿ أَنَا ﴾. |
| 15 | ۬ | هەبوونی بازنەی تاریك لەسەر هەمزە, نیشانەی سووککردنی هەمزەی ئاسانکردنە (التسهیل)، وەکوو: ﴿ ءَا۬عۡجَمِيّٞ ﴾ فصلت:شمشم |
| 16 | اْ، وْ، يْ | ئەگەر ئەم بازنە بچووکە لەسەر ئەم سێ پیتانە بێت, ناخوێندرێنەوە، وەکوو: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ ﴿ بِأَيْيْدٖ ﴾ ﴿ مِاْئَةِ ﴾ |
| 17 | ً ٍ ٌ | سەرو ژێر بۆ خوێندنەوەی نونی تەنوینی ئاشکرا (اظهار), وەکوو: ﴿ عَيۡنٍ حَمِئَةٖ ﴾ |
| 18 | ٗ ٖ ٞ | سەروژێر بۆ خوێندنەوەی نونی تەنوین بە ئیدغام یان بە شاردنەوە ( ئیخفاء), وەکوو: ﴿ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ﴾ |
| 19 | ۢ | گۆڕینی پیتی(نْ)ی ساکن و نونی تەنوینە, بۆ پیتی (م), کە پێی دەڵێن: (القلب). |
| 20 | ن | ئەگەر نونی بچووك لەسەر وشەکە بێت, نیشانەی ئەوەیە, کە ئەم نونە لە وشەکە سڕاوەتەوە، بەڵام دەخوێندرێتەوە، وەکوو: ﴿ نُۨجِي ﴾ الإنسان: تيتي |
| 21 | ۩ | نیشانەی کڕنۆش(سەجدە)ی خوێندنەوەیە، وەکوو: ﴿ كَلَّا لَا تُطِعۡهُ وَٱسۡجُدۡۤ وَٱقۡتَرِب ۩ ١٩ ﴾ العلق: نيتر |
| 22 | ط | نیشانەی ئەوەیە خوێنەرەکە ئازادە کە نەوەستێت, بەڵام ئەگەر بوەستێت باشترە, (بەڵام نەك لە هەموو شوێنێك) |
| 23 | ز | دروستە بوەستین، بەڵام نەوەستین باشترە. |
| 24 | ص | نیشانەی وەستانە، بەڵام تەنیا ئەو کاتەی کە پێویستە. |
| 25 | ع | نیشانەی ڕکوع, لە کەنار قورئانە (ترکی , هندی، پاکستان )یەکان نووسراوە. |

## ڕێگاکانی نووسین و کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز لەسەردەمی پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و هاوەڵەکان

ﺗ- نووسینی قورئان لە دیوانی پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و بە ئامادەبوونی جبریل (عَلَيْهِ السَّلَامُ) لەسەر گەڵای دارخورما و بەرد و ئێسك و پێستی گیانەوەران.





ﻳﺮ- بەتاڵکردنەوەی قورئان لە پارچەی جیاجیا بۆ لاپەڕەی دروستکراو لە پێستی ئاسك, لەسەردەمی (أبي بكر الصِّدِّيق), بەدەستی (زيد بن ثابت) خودا لێی ڕازی بێت.



سم- کۆپیکردنی چەند دانەیەك لە قورئانی پیرۆز, لەسەردەمی (عثمان بن عفان) خودا لێی ڕازی بێت, دوای ئەویش, موسڵمانان تا ئەمڕۆ کۆپی دەکەن.





شم- دانانی سەروژێر (حرکات)ەکان لەسەر و ژێری پیتەکان و بەشێوەی خاڵ بە ڕەنگی سوور لەسەردەمی (علي بن ابي طالب) و بە دەستی (أبو الأَسْوَدْ الدُّوئلي) خودا لێیان ڕازی بێت.





- دانانی خاڵ لەسەر و ژێری پیتەکان, لەسەردەمی (حجاج بن يوسف الثقفي) و بەدەستی هەردوو زانا (النصر بن عاصم الليثي و يحيى بن يعمر), پەروەردگار لە هەموان ڕازی بێت, تاکوو پیتەکان لێکجیا بکرێنەوە.

ح ح ح د د ر ر ى ← ج ح خ د ذ ر ز ي

6- زانای بەناوبانگ (الخليل بن أحمد الفراهيدي) هەستا بە گۆڕینی خاڵە سەروژێرەکان بۆ (فتحة و كسرة وضمة وسكون), بەم شێوەیەی ئێستا ئێمە لەسەر قورئان دەیبینین, هەروەها دروستکردنی وێنەیەك بۆ هەمزە و پیتی عەین و سکون و شەددە.

بۆ زانیاریی زیاتر بگەڕێوە بۆ سەرەتای ئەم کتێبە.

## بنەماكانی نووسینەوەی قورئانی پیرۆز

لەسەردەمی خیلافەتی (عُثمان بن عَفَّان)(خودا لیَی رِازِي بيت), خەلیفە بڕیاری دا قورئانی پیرۆز جارێكی دیكە بنووسرێتەوە و چەندین دانەی لێ كۆپی بكرێت، بەڵام بە هەموو ئەو شێوازانە بخوێندرێتەوە, كە پێغەمبەر(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)خوێندووەتییەوە، بۆیە دەبینین هەندێك پیت نەنووسراونەتەوە، چونكە پێغەمبەر نەیخواندبوونەوە و هەندێك پیتیش لە هەندێك وشە زیاد كراون، چونكە ئەو وشانە بەچەندین شێوە خوێندراونەتەوە بەپێی ڕیوایەت و قیرائەتە جیاجیاكان، ئەمە لەلایەك, لەلایەكی دیكەوە, خەلیفە دەیویست ئەو قورئانانە لەناو ببات, كە لای خەڵك دەستكاریكراون (بەزیادەكردنی پیت یان وشە, یاخود جێگۆڕكێ كردن بەشوێنەكانیان, یاخود بە زیادكردنی واتا), لەم سۆنگەیەوە عثمان (خودا لیَی رِازِي بيت), جارێكی دیكە قورئانی لەسەر شەش بنەما نووسییەوە,[1] ئەو بنەمایانەی كە هاوەڵان (سەحابە) لە خوێندنەوەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وەریگرتوون، ئەوانیش ئەمانەن:

أ- بنەمای زیادكردن (قاعدة الزيادة): وەكوو زیادكردنی ئەلیف دوای (واو)ی كۆ (آمَنُواْ)، یان لە ناوەڕاستی هەندێك وشەدا، وەكوو: (لِشَاْيْءٍ ، مِاْئَةٍ)، یان زیادكردنی (واو) لە هەندێك وشەدا، وەكوو: (أُوْلَٰئِكَ)، یان زیادكردنی یاء، وەكوو: (بِأَيْيْدٍ), بەڵام ئەم پیتانەی كە زیاد كراون, نەدەخوێندرانەوە.

ب- بنەمای سڕینەوە (قاعدة الحذف): لە هەندێك وشە لە قورئاندا, پیتەكانی( ا ، و، ي ، ل ، ن ) سڕاونەتەوە و, ئەلیفیش لە هەموو پیتەكانی دیكە زیاتر سڕاوەتەوە، وەكوو:

﴿ مَالِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ ________ ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ سڕینەوەی ئەلیف

﴿ وَيَدۡعُو ٱلۡإِنسَٰنُ ﴾ ________ ﴿ وَيَدۡعُ ٱلۡإِنسَٰنُ ﴾ سڕینەوەی واو

﴿ إِبۡرَاهِيمَ ﴾ ________ ﴿ إِبۡرَٰهِمَ ﴾ سڕینەوەی یاء و ئەلیف

﴿ ٱللَّذِينَ ﴾ ﴿ وَٱللَّيۡلِ ﴾ ________ ﴿ ٱلَّذِينَ ﴾ ﴿ وَٱلَّيۡلِ ﴾ سڕینەوەی لام

﴿ نُنۡجِي ﴾ ________ ﴿ نُجِي ﴾ سڕینەوەی نون

---

(1) إعجاز رسم القرآن: (صبرسم-لهشم)؛ هداية اولي الالباب الى شرح عقيلة الاتراب:(صربي)

سم- بنەمای هەمزە (قاعدة الهمز): هەمزە لە سەرەتای وشە بە ئەلیف دەنووسرا، وەکوو: (إِنَّ، أَسۡبَاطًا، أُمَمًا) بەڵام هەمزەی ناوەڕاست و کوتایی وشە, هەندێك جار بەئەلیف و هەندێك جار بە (واو) و هەندێك جاریش بە یاء دەنووسرا, ئەویش بەپێی حەرەکەی هەمزە و حەرەکەی پێش ئەو, وەك: (ٱلۡأَمِينُ, يُؤۡمِنُونَ, وَجِئۡتُكَ, مُؤَذِّنٌ , يُنشِئُ, عُلَمَٰٓؤُاْ, ٱلسَّمَاءَ)

شم- بنەمای گۆڕین (قاعدة الابدال): هەندێك وشە لە قورئانی پیرۆزدا بە هەندێك پیت دەخوێندرێنەوە، بەڵام بۆ هەندێك پیتی دیکە گۆڕدراون، وەکوو:گۆڕینی ئەلیف بۆ (واو) (ٱلصَّلَوٰةَ, ٱلزَّكَوٰةَ) یان گۆڕینی ئەلیف بۆ یاء (بِٱلۡهُدَىٰ, يَخۡشَىٰ) یان گۆڕینی نونی جەختکردنەوە یا سووك بۆ ئەلیفی تەنوین، وەکوو: (وَلَيَكُونًا ، لَنَسفَعًا)، یان گۆڕینی هائی خرٍ بۆ تائێکی کراوە، وەکوو: (رَحۡمَةَ ⟵ رَحۡمَت) (نِعۡمَةَ ⟵ نِعۡمَت).

له- بنەمای بەیەکگەیاندن و پچڕاندن (قاعدة الفصل والوصل): زۆر وشەی هاوشێوە لە قورئاندا هەن، بەڵام نووسینی ئەو وشانە, هەندێك جار دەبینین کە پێکەوە نووسراون, هەندێك جاریش دەبینین, کە لێکجیا نووسراون, وەکوو:

( أَنۡ لَا ______ أَلَّا ) ، ( كُلَّ مَا ______ كُلَّمَا )

- بنەمای دوو جۆری خوێندنەوە لە وشەیەکدا (قاعدة مافيه قراءتان): هەندێك وشە لە قورئاندا بە دوو شێوە یان زیاتر دەخوێندرێنەوە، بەڵام بە یەك شێوە نووسراون، وەکوو: ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ ﴿فَتَبَيَّنُوٓاْ﴾ هەندێك وشەی دیکە هەن, بە دوو شێوە دەخوێندرێنەوە, بەڵام نابێت بە یەك شێوە بنووسرێنەوە, بۆیە(عثمان بن عفان) خودا لێی ڕازی بێت, هەستا ئەو وشانەی بە شێوەیەك لە ناو قورئانێکدا نووسییەوە, هەروەها هەمان ئەو وشانەی بە شێوەیەکی دیکەی جیاوز, لە ناو قورئانێکی دیکەدا نووسییەوە، وەکوو:
﴿وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبۡرَٰهِۧمُ بَنِيهِ﴾ لە هەندێك لە قورئانەکاندا نووسراوە ﴿وَأَوۡصَّىٰ بِهَآ إِبۡرَٰهِۧمُ بَنِيهِ﴾

**تێبینی**

ئەم بنەمایانەی کە (عثمان بن عفّان), پەیڕەوی کردن, هەموو ئەوانە بوون, کە پەروەردگار, قورئانی پێ دابەزاندبوو, پێغەمبەریش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە هاوەڵانی فەرموو کە ئاوا بنووسنەوە, بەڵام (عثمان) لەسەر کۆپییەکانی قورئانی پیرۆز بڵاوی کردنەوە, چونکە هەموو جۆرەکانی خوێندنەوە لە کۆپییەکدا نەدەنووسرانەوە.

# تایبەتمەندییەکانی قورئانی پیرۆز

قورئانی پیرۆز بە زمانی عەرەبی دابەزیوە و بە یاساکانی زمانی عەرەبیش دەخوێندرێتەوە, بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا, قورئان هەندێك تایبەتمەندیی هەیە, چ لە (نووسین یان خوێندنەوەدا), جیاوازییەکانی قورئان لەگەڵ ئەو (عەرەبی)یەی کە باوە, جیا دەکاتەوە.

ئیمامی جەزەری, خودا لێی ڕازی بێت, ئاماژەی بەو تایبەتمەندییانە کردووە و پێناسەیەکی داوە بە قورئان, تاکوو بناسرێتەوە, کە کتێبی پەروەردگارە و لە کتێبە عەرەبییەکان جیا بکرێتەوە, هەروەك دەڵێت [1]:

فكُلُّ مَا وَافَقَ وَجْهَ نَحْوِ ....... وَكَانَ لِلرَّسْمِ احْتِمَالاً يَحْوِي
وَصَحَّ إسْنادًا هُوَ الْقُرآنُ ....... فَهَـذِهِ الثَّـلاثَةُ الأَرْكَـانُ
وحَيثُما يَخْتَلَّ رُكْنٌ أَثْبِتِ ...... شُذُوذَهُ لَوْ أنَّهُ فِي السَّبعَةِ

بەپێی ئەم چەند دێڕە شیعرە و ئەو زانیارییانەی کە دەست ئێمە کەوتوون, دەتوانین بڵێین تایبەتمەندییەکانی قورئانی پیرۆز لەگەڵ هەر کتێبێکی عەرەبی لەڕووی خوێندنەوە و نووسینەوە, لەم خاڵانەدا بەرجەستە دەبێت:

**تز- لەڕووی شیکارکردنەوەوە:**

پێویستە قورئان بەپێی ئەو حەرەکانە بخوێندرێتەوە, کە پەروەردگار ڕێی بە ئێمە داوە, کە پێی بخوێنینەوە, هەروەها پێغەمبەریش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆ سەحابەکان خوێندبێتییەوە و بە ڕێگای زانایانی خوێندنەوەوەش گەیشتبن بە ئێمە، وەکوو:﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ﴾ لە قیرائەتی(عاصم)، یان ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمَ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٌ﴾ (البقرة: بيسم) لە قیرائەتی (إبن كثير).

**يز- لەڕووی نووسینەوە:**

تز- نووسینی وشە و پیتەکانی قورئان لە زۆر شوێن, وەك نووسینی باو نییە, لە زمانی عەرەبیدا، وەکوو: ﴿مَٰلِكِ , ٱلسَّمَٰوَٰتِ , إِۦلَٰفِهِمۡ , يحۦي , نُجِي ﴾

يز- نووسینی هەندێك وشە بە جیا یان پێکەوە، وەکوو: ( مِن مَّا , مِمَّا )

سە- هەبوونی هەندێك پیت, بەڵام ناخوێندرێنەوە, وەکوو: (أُوْلَٰٓئِكَ) یاخود هەندێك پیت نانووسرێن, بەڵام دەخوێندرێنەوە, وەکوو: (نُجِي), یان بەشێوەیەك نووسراون، بەڵام بەشێوەیەکی دیکە دەخوێندرێنەوە, وەکوو:( بَصۜطَةً )

---

[1] طيبة النشر:(صير)؛ شرح طيبة النشر للنويري: (جتز/ صلهبرتز)

سمـ- لەڕووی سەنەدەوە: ئەمەش دوو لا بەخۆیەوە دەگرێت:

أ- لەلایەن ئەو کەسانەوە, کە بۆ ئێمەیان گواستووەتەوە, لە(هاوەڵان و شوێکەوتووان و زانایان):

ئەم قورئانە لە پەروەردگارەوە گەیشتووە بە پێغەمبەر, بەهۆی جبریلەوە (علیه السَّلام),
پاشان هاوەڵان لە پێغەمبەرەوە وەریانگرتووە و شوێنکەوتوو (تابع)ییەکانیش لە هاوەڵان وەریانگرتووە, ئینجا زانایانیش لە تابعییەکان وەریانگرتووە, پاشان یەك لە دوای یەك بە ڕێگای دروست و زانایانی جێی متمانەوە, ئەو سەنەدە بە ڕێگای (تەواتر)ەوە بۆ ئێمە گواستراوەتەوە و دەبێت ئێمەش بە تەواوی بگەیەنین بەو کەسانەی کە جێی متمانە و باوەڕن.

ب- لەڕووی خوێندنەوەوە:

گواستنەوەیەکی دروست لەلایەن زانایانەوە بۆ خوێندنەوەی پیتەکان و یاساکانی تەجوید, تاکوو وشە و ئایەتەکان دروست بخوێندرێنەوە، وەکوو:

ﺘﺮ- درێژکردنەوەی پیتە مەددییەکان لە کاتە جیاجیاکاندا, بەپێی جۆری مەددەکە, وەکوو: (مد الواجب ﯜﻤ, لە حەرەکە) ، المد الجائزﯜﻤ, لەحەرەکە) ، المد اللازم ( حەرەکە) و.....هتد ).

ﯿﺮ- وەستانی درێژ لەسەر غوننەی پیتەکانی(م ، ن), لەو یاسایانەی غوننەی لەگەڵدایە, وەکوو:

( میم و نونەکانی بەشەددە, یان ئیدغامی بە غوننە و ئیقلاب و ئیخفاء)

سمـ- وەستانە کورت (السکت)ەکان, وەکوو: ﴿وَقِيلَ مَنۜ رَاقٍ ، كَلَّاۖ بَلۜ رَانَ ...... هتد ﴾

شمـ- خۆشکردنی دەنگ لەگەڵ خوێندنەوەی قورئان, وەکوو پێغەمبەر(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)فەرمووی (لیس منّا من لم یتغن بالقرآن)[1] واتە: لە ئێمە نییە ئەوەی لەگەڵ خوێندنەوەی قورئان دا, دەنگی خۆی خۆش نەکات.

بەم تایبەتمەندییانە, قورئانی پیرۆز لە کتێبەکانی دیکە جیا دەکرێتەوە و قورئان دروست دەخوێندرێتەوە, هەروەها قورئانخوێنیش خێر و پاداشتی پێدەگات.

اللهم صل على محمد وعلى آله وصحبه وسلم

( ) مسند أحمد:(جﺘﺮ/صﻴﺮﺒﻴﺘﺮ) ؛ صحيح البخاري:(جﻨﻲ/صﺮﺸﻢﻠﻬﺘﺮ)

چەند وشەیەك لە قورئاندا هەن, پێویستە وشیار بین, تاكوو ڕاست و دروست بخوێندرێنەوە

| وشەكانی قورئان | خوێندنەوەی دروست | سورەت |
|---|---|---|
| وَلَا ٱلضَّآلِّينَ | خوێندنەوە بە ضادە, نەك بە ظاء | الفاتحة |
| مُسَلَّمَةٌ | (لام), فەتحەی لەسەرە لەگەڵ شەددە | البقرة |
| فَٱدَّٰرَٰٔتُمۡ | هەمزە, سكونی لەسەرە بەبێ مەددە | البقرة |
| مُسۡلِمَيۡنِ | میمی دووەم, فەتحەی لەسەرە نەك كەسرە | البقرة |
| بِنَهَرٖ | (هاء), فەتحەی لەسەرە نەك سكون | البقرة |
| فَنِعِمَّا هِيَۖ | (عین), كەسەری لەژێرە, هەروەها درێژكردنەوەی غوننەی میم | البقرة |
| لَا يَأۡلُونَكُمۡ | هەمزە, سكونی لەسەرە بەبێ مەددە | آل‌عمران |
| يَأۡتِيَٰنِهَا | مەددی ئەلیف لە پاش یائی (مفتوح)ەوەیە | النساء |
| ٱلۡعَنَتَ | بەتەنیا لامێكە و ساكنیشە, عەینیش مەفتوحە | النساء |
| لَّيُبَطِّئَنَّ | (یاء), (ضمَة)ی لەسەرە و (طاء)یش كەسرەی بەشەددەی لەسەرە | النساء |
| مَلَكٗا ، وَلَلَبَسۡنَا | لامی(مَلَكٗا) فەتحەی لەسەرە،(باء)یش فەتحەی لەسەرە نەك كەسرە | الأنعام |
| شِيَعٗا | (یاء), فەتحەی لەسەرە نەك سكون | الأنعام |
| دِينٗا قِيَمٗا | (قاف), كەسەری لەژێرە, (یاء)یش فەتحەی لەسەرە بەبێ شەددە | الأنعام |
| إِنَّ وَلِـِّۧيَ | یائی یەكەم مەكسورە, یائی دووەمیش مەفتوحە | الأعراف |
| مِّن وَلَٰيَتِهِم | (واو), فەتحەی لەسەرە, نەك كەسرە | الأنفال |
| أَوۡ مُدَّخَلٗا | (لام), (ضمَة)ی لەسەرە, (دال)یش فەتحە و شەددەی لەسەرە | التوبة |
| يُضَلُّ بِهِ | (یاء), (ضمَة)ی لەسەرە, (ضاد)یش, فەتحەی لەسەرە, نەك كەسرە | التوبة |
| أَمَّن لَّا يَهِدِّيٓ | (هاء), كەسرەی لەژێرە, (دال)یش, كەسرەی بەشەددەی لەژێرە | یونس |
| قُلۡ إِي وَرَبِّيٓ | (إي), كەسرەی لەژێرە, ئینجا هەمزە و پاشان یائی مەددەیە | یونس |
| يَٰبَنِيَّ لَا تَدۡخُلُواْ | (باء), فەتحەی لەسەرە نەك (ضمَة) | یوسف |

| بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٜىٰهَا | لاركردنەوەى ئەليف بۆ ياء و فەتحەى سەر ڕاء بۆ كەسرە | هود |
|---|---|---|
| أَفَلَمۡ يَاْيۡـَٔسِ | (يَاْيۡـَٔسِ) ئەليف ناخوێندرێتەوە, يائى دووەميش سكونى لەسەرە و هەمزەش, فەتحەى لەسەرە | الرّعد |
| ٱللَّهِ ٱلَّذِي | (هاء), كەسرەى لە ژێرە | إبراهيم |
| رُّبَمَا يَوَدُّ | (باء), فەتحەيەكى بێ شەددەى لەسەرە | الحجر |
| وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ | (كاف), فەتحەى لەسەرە,(لام)يش,شەددەى لەسەرە لەگەڵ تەنوين | النّحل |
| بِخَيۡلِكَ وَرَجِلِكَ | (راء), فەتحەى لەسەرە, كەسرەش لەژێر(جيم)ە | الإسراء |
| بِوَرِقِكُمۡ | (راء), كەسرەى لەژێرە, نەك فەتحە | الكهف |
| بِمَلۡكِنَا | ميم, فەتحەى لەسەرە, نەك كەسرە يان (ضمَة) | طه |
| صَنۡعَةَ لَبُوسٖ | (صاد), فەتحەى لەسەرە و (لام)يش فەتحەى لەسەرە | الأنبياء |
| طُورِ سَيۡنَآءَ | (سين), فەتحەى لەسەرە, نەك كەسرە | المؤمنون |
| وَيَتَّقۡهِ | (تاء), شەددە و فەتحەى لەسەرە, سكونيش لەسەر (قاف)ە | النور |
| مَطَرَ ٱلسَّوۡءِ | (سين), فەتحەيەكى بەشەددەى لەسەرە, نەك(ضمَة) | الفرقان |
| أَنۡعَٰمٗا وَأَنَاسِيَّ كَثِيرٗا | (أَنَاسِيَّ) فەتحە لەسەر هەمزەيە و كەسرە لەژێر سينە و فەتحەيەكى بەشەددەش لەسەر (ياء)ە | الفرقان |
| وَأَزۡلَفۡنَا ثَمَّ ٱلۡأٓخَرِينَ | (ثَمَّ), (ثاء), فەتحەى لەسەرە نەك(ضمَة) | الشعراء |
| وَلَا تَكُن فِي ضَيۡقٖ | (ضاد), فەتحەى لەسەرە, (ياء)يش سكونى لەسەرە | النمل |
| أَسَٰٓـُٔواْ ٱلسُّوٓأَىٰٓ | خوێندنەوەى ئەليف و (واو) بە مەددى پێويست وبەيەكگەيشتوو | الروم |
| لِّلۡعَٰلِمِينَ | لامى سێيەم, كەسرەى لەژێرە, نەك فەتحە | الروم |
| ٱلۡغَرُورُ | (غين), فەتحەى لەسەرە, نەك (ضمَة) | لقمان |
| وَهُمۡ يَخِصِّمُونَ | (خاء), كەسرەى لەژێرە, هەروەها (صاد)يش, كەسرەيەكى بەشەددەى لەسەرە | يس |
| جِبِلّٗا كَثِيرًاۖ | (جيم) و (باء ), كەسرەى لەژێرە, نەك فەتحە | يس |

| أَزِفَتِ ٱلۡأٓزِفَةُ | ( ٱلۡأٓزِفَةُ) خوێندنەوەی ئەلیف, دوای هەمزە بە مد البدل | النجم |
|---|---|---|
| أَرِنَا ٱلَّذَيۡنِ أَضَلَّانَا | (ٱلَّذَيۡنِ) فەتحە لەسەر ذالە و سکونیش لەسەر یائە | فصلت |
| أَتَعِدَانِنِيٓ | کەسرە لەژێر هەردوو نوندایە | الأحقاف |
| ٱلسَّلۡمِ<br>يَتِرَكُمۡ | (ٱلسَّلۡمِ) فەتحە لەسەر سینە و سکونیش لەسەر لامە<br>(يَتِرَكُمۡ) کەسرە لەژێر تائە و فەتحە لەسەر ڕائە | محمد |
| ذَنُوبٗا مِّثۡلَ ذَنُوبِ | فەتحە لەسەر هەردوو ذالە | الذاريات |
| تَقَوَّلَهُ | فەتحە لەسەر هەردوو پیتی (قاف) و (واو)ە | الطور |
| مِن قِبَلِهِ ٱلۡعَذَابُ | کەسرە لەژێر قافە و فەتحەش لەسەر بائە | الحديد |
| كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ | (دُولَةَۢ) (ضمة) لەسەر دالە, نەك فەتحە | الحشر |
| بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمۡ | (ضمة) لەسەر بائە, مەددی بەیەکگەیشتوو(مد متصل)یش دوای هەمزەی یەکەم | الممتحنة |
| بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ | فەتحە لەسەر صادە, هەروەها فەتحە لەسەر (کاف) و(واو)یشە | الممتحنة |
| خَٰلِدَيۡنِ | فەتحە لەسەر دالە و سکونیش لەسەر یائە | الحشر |
| قِبَلَكَ مُهۡطِعِينَ | کەسرە لەژێر قافە و فەتحەش لەسەر بائە | المعارج |
| أُوْلِي ٱلنَّعۡمَةِ | فەتحە لەسەر نونە لەگەڵ شەددە | المزمل |
| وَٱلَّيۡلِ إِذۡ أَدۡبَرَ | بە"إذ" دەخوێنینەوە, بە سکون, نەك بە ئەلیف "إذا" | المدثر |
| كُفُوًا أحد | (ضمة) لەسەر فائە, نەك سکون | الاخلاص |
| تَلَقَّوۡنَهُۥ | فەتحە لەسەر لامە و فەتحەیەکی بەشەددەش لەسەر قافە | النّور |
| عَلَيۡهُ ٱللَّهَ | (ضمة) لەسەر هائی یەکەمە, فەتحەش لەسەر هائی دووەمە | الفتح |
| لَوَّوۡاْ رُءُوسَهُمۡ | فەتحە لەسەر لامە و شەددە و فەتحە لەسەر واو | المنافقون |
| تَفۡجُرَ لَنَا | فەتحە لەسەر تائە و سکون لەسەر فائە و (ضمَّة) لەسەرجیمە | الاسراء |
| لَا يَلِتۡكُم | کەسرە لەژێر لامە و سکون لەسەر تائە و (ضمَّة) لەسەر کافە | الحجرات |

## كۆتـايى

حەمد و سوپاس بۆ پەروەردگار, دواى تێپەڕبوونى ماوەيەكى دووورودرێژ لەگەڵ خوێندنەوە و شرۆڤەكردنى تەجويدى قورئانى پيرۆز و بەدەستهێنانى ئەزموونەكى كردەيى لە بەرنامەكانى تەلەڤزيۆن و راديۆ و ئەڵقەكانى قورئان خوێنان دا، لەسەر كۆى ئەو زانيارييانەى كە دەستم كەوتوون, توانيم ئەم پەرتووكە بەناوى (تەجويدى شايان بۆ فێربونى قورئان)بەشێوەيەكى ئاسان و پڕ لە زانيارى, بخەمە بەردەستى قورئانخوێنەكان, تا سوودى لێوەرگرن.
هەڵبەت زۆر هەوڵم داوە كە ئەم پەرتووكە پاك بێت لە هەڵە, بەڵام ناتوانم بڵێم بێ هەڵە و كەموكوڕييە, چونكە تەنيا قورئانى پيرۆز بێ هەڵە و كەموكوڕييە.
بۆيە داوامان لە پەروەردگار ئەوەيە، كە خێرى ئێمە و هەموو ئەو كەسانەش بنووسێت, كە پشتيوان بوون بۆ بلاوكردنەوەى ئەم پەرتووكە و بە بەهەشت شادمان بكات.

والصَّلاة والسَّلام على محمَّد وعلى آله وصحبه أجمعين
والسَّلام عليكم ورحمة اللَّه وبركاته

نووسەر
محمد أمين ملا عبدالغفور

| ژ | ناوی سەرچاوە | ناوی نووسەر |
| --- | --- | --- |
| ت | قورئانی پیرۆزی (مصحف المدينة بالرسم العثماني). | |
| ي | تەفسیری ئاسان | نووسینی مامۆستا بورهان محەمەدئەمین. |
| □ | مسند الامام أحمد بن حنبل/الطبعة الاولى/عالم الكتب/نيتشمترھـتيتينيترم | أبو عبدالله أحمد بن محمد بن حنبل الشيباني (ت تشميرھـ) |
| □ | مسند الدرامي(سنن الدرامي)الطبعة الاولى/يرتشمترھـ-بربربريرم/دار المغني للنشر/السّعودية | أبو محمد عبدالله بن عبدالرحمن بن الفضل الدرامي(ت لھ لهيرھـ) |
| لھ | الجامع المسند الصحيح المختصر= صحيح البخاري/الطبعة الاولى/يريشمترھـ-تربربريرم/دار طوق النجاة | محمد بن إسماعيل أبو عبد الله البخاري(ت))/المحقق: محمد زهير بن ناصر |
| □ | المعجم الكبير/الطبعة الاولى/ لهتشمترھـ-شمنينيترم/دار الصميعي-الرياض | سليمان بن أحمد بن أيوب بن مطير الشامي، أبو القاسم الطبراني(تبر□سمھـ) |
| □ | المسند الصحيح المختصر /صحيح مسلم/دار إحياء التراث العربي-بيروت | مسلم بن الحجاج أبو الحسن النيسابوري (تتر□يرھـ) المحقق:محمد فؤاد عبد الباقي |
| □ | سنن الترمذي/الجامع الصحيح/دار الفكر للطباعة والنشر | للامام الحافظأبي عيسى محمد بن عيسى بن سورة الترمذي(نيبربر-نييييرھـ) |
| □ | السنن الكبير/الطبعة الاولى /يرسمشمترھـ-ترتربريرم/مركز هجر للبحوث والدراسات العربية والاسلامية | أبو بكر أحمد بن الحسينبن علي البيهقي(شمتيسمتي لهشمھـ))/تحقيق: الدكتور عبدالله بن عبد المحسن التركي |
| ت□ | مسند أبي داوود الطيالسي/الطبعة الاولى/نيتشمترھـنينينيترم/دار هجر-مصر | أبو داود سليمان بن داود بن الجارود الطيالسي البصري(تشمبريرھـ) |
| تت | التجويد المصور/الطبعة الثانية/يرسمشمترھـ -ترتربريرم/مكتبة ابن الجزري/دمشق | د.أيمن رشدي سويد |
| تي | المنير في أحكام التجويد الطبعة يريير/شمسمشمترھـ سمتربريرم | إعداد لجنة التلاوة(جمعية المحافظة على القرآن الكريم) الاردن |
| ت□ | الملخص المفيد في علم التجويد / الطبعة السادسة/يريشمترھـ – يربربريرم | محمد أحمد معبد، (مدرس القرآن الكريم والتجويد بالمسجد النبوي الشريف) |

| | | |
|---|---|---|
| تر □ | الميسر في علم التجويد، الطبعة الاولى/بزسمشمترهـ-نيبزبزيزم | أ. د. غانم قدُوري الحمد |
| تر لھ | قواعد التلاوة وعلم التجويد، الطبعة الاولى بزسمشمترهـ –نيبزبزيزم | فرج توفيق الوليد |
| تر □ | الاتقان في علوم القرآن/ الطبعة الاولى/مؤسسة الرسالة ناشرون | الامام جلال الدين السيوطي(تترترنيهـ) |
| تر □ | مناهل العرفان في علوم القرآن/ الطبعة الاولى/ لھترشمترهـ-لھنينيترم/دار الكتاب العربي | الشيخ محمد عبد العظيم الزرقاني |
| تر □ | دليل الحيران مورد الظمان في فني الرسم والضبط | الشيخ إبراهيم بن أحمد المارغني التونسي |
| تر □ | اللُمعة البدرية شرح متن الجزرية للامام الجزري | محمود محمدعبد المنعم العبد |
| يز □ | غاية المريد في علم التجويد/الطبعة الرابعة شمترشمترهشمنينيترم | عطية قابل نصر |
| يز تر | الفوائد المرتبة على الفوائد المهذبة /مطبعة مصطفى البابي الحلبي وأولاده/بيشمسمترهـ | الشيخ علي محمد الضَّباع |
| يز يز | المنح الفكرية في شرح المقدمة الجزرية/الطبعة الثانية/سمسمشمترهـ شمتربزيزم | ملا علي القارى/ تحقيق اسامة عطايا |
| يز □ | جهد المقلّ: محمد أبي بكر المرعشي/الطبعة الثانية،نييزشمترهـ/تيبزبزيزم/ عمان-الاردن | تحقيق: د.سالم قدوري الحمد |
| يز □ | منظومة المفيد في التجويد/للامام شهاب الدين الطيبي /برترنيهـ - تنييينيهـ | تحقيق/الدكتورأيمن رشدي سويد |
| يز لھ | رخيم الحواشي على نونية السخاوي/الطبعةالاولى / نييزشمترهـ | عبد الرحمن أبوحمزة المغربي |
| يز □ | المحكم في نقط المصاحف/الطبعة الثانية /دار الفكر-دمشق تيترشمترهبينينيترم | أبو عمر الداني (تشمشمشمهـ)، تحقيق:الدكتور عزت حسن |
| يز □ | هداية القاري الى تجويد كلام الباري/الطبعة الثانية/مكتبة طيبة | عبد الفتاح السيد عجمي المرصفي تنيبزشمترهـ |
| يز | لآلئ البيان في تجويد القرآن | إبراهيم على شحاتة السمنودي |

| ير | الفوائد التجويدية في شرح المقدمة الجزرية/الطبعة الاولى تي ترشمتره | عبد الرزاق بن علي موسى |
|---|---|---|
| [illegible] | القطع والائتناف/ دار الكتب العلمية | أبي جعفر أحمد بن محمد بن إسماعيل النحاس ت/تيسمسمه تحقيق أحمد فريد المزيدي |
| تر | المرشد في علم التجويد /الطبعة الثالثة /بينيتر دار الفرقان | للشيخ زيدان محمودالعقرباوي |
| ير | القصد النافع لبغية الناشئ والبارع على الدرر اللوامع في مقرئ الامام نافع/الطبعة الاولى | علي بن محمد التازي/شرح الامام محمد بن إبراهيم الشريشي/تحقيق: التلميدي محمد محمود |
| [illegible] | الروضة الندية في شرح متن الجزرية | الشيخ الإمام محمد بن يوسف الجزري شرح محمود محمد عبد المنعم العبد |
| [illegible] | الاصول النيّرات في القراءات/الطبعة الثالثة/مدار الوطن للنشر/يرسشمتره-ترتربريرم | أ. أماني بنت محمد عاشور |
| لهـ | أحكام قراءة القرآن الكريم/الطبعة الرابعة/نينينيتر | للمؤلف/محمود خليل الحصري تحقيق /محمد طلحة منيار |
| [illegible] | البدور الزاهرة في القراءات العشر المتواتر/دار الكتاب العربي /بيروت | عبد الفتاح القاضي(تسمبرشمتره) |
| [illegible] | شرح طيبة النشر في القراءات العشر/تينيتر | ابو القاسم النويري(تبي لهتيه)/تحقيق عبد الفتاح السيد سليمان أبو سنة |
| [illegible] | غاية النهاية في طبقات القراء/ الطبعة الاولى /يرشمتره-بربريرم /دار الكتب العلمية-بيروت | شمس الدين محمد بن محمد بن محمد بن علي الجزري(تسمسمتيه) |
| [illegible] | المقدمة فيما على قارئه أن يعلمه /جمعية القرآن الكريم/جدة بيبرشمتره | محمد بن محمد الجزري/ تحقيق د. ايمن رشدي سويد |
| [illegible] | تحفة الاطفال/مكتبة محمد علي/القاهرة | الامام سليمان الجمزوري (تتينيترتره) |
| تر | الألفات في القرآن الكريم | إكرامي بن عبد العاطي المحلاوي |
| [illegible] | التمهيد في علم التجويد /دار الكتب العلمية | محمد بن محمد بن علي بن يوسف |

| ژ | سەرچاوە | نووسەر |
|---|---|---|
| □□ | حق التلاوة/ الطبعة الشرعيةشميرشمترهـ- شمبربريرم | حسني شيخ عثمان |
| □□ | البرهان في تجويد القرآن/الطبعة الاولى/ لهبرشمترهـ- لهتىنىترم/بيروت | محمد الصّادق قمحاوي |
| □له | النشرفي القراءات العشر/دارالكتب العلمية/بيروت | أبو الخير محمد بن يوسف الجزري(تسمستيهـ) |
| □□ | معرفة القراء الكبارعلى الطبقات والاعصار/إستانبول /□ترشمترهـ- لهنينيترم | للامام شمس الدين بن عبدالله لذهبي (تتيشمبيهـ)تحقيق الدكتور طيارآلتي كولاج |
| □□ | علم التجويد/أحكام نظريةوملاحظات تطبيقية /الطبعة العاشرة /دار الغوثاني/ لهمشمترهـ- شمتربريرم | د. يحيى عبد الرزاق الغوثاني |
| □□ | إعجاز رسم القرآن وإعجاز التلاوة/ الطبعةالاولى /بييرشمترهـ/□بربريرم/دار السلام | محمد شملول |
| □□ | عنوان الدليل من مرسوم خط التنزيل/ الطبعة الاولى/برنينيترم | ابو العباس أحمد ابن البناء المراكشي/ تحقيق وتقديم:هند شلبي |
| له□ | نهاية القول المفيد في علم تجويد القرآن المجيد/ الطبعة الاولى/دار الكتب العلمية/شميرشمترهـ- سمبربريرم | محمد مكي نصر تلهبرسمترهـ /ط نيشمسمترهـ<br>ضبط وتصحيح: عبدالله محمود محمد عمر |
| لهتر | محاضرات الشيخ الدكتور أيمن رشدي سويد | لسەر شاشا (إقرأ) |
| لهير | المستطرف في كل فن مستظرف/الطبعة الخامسة/نييرشمترهـتيبربريرم/دار المعرفة- بيروت | شهاب الدين محمد بن أحمد الأبشيهي/ تحقيق: محمد خير طعمة الحلبي |
| له□ | التحديد في الاتقان والتجويد/الطبعة الاولى/بيبرشمترهـتيتينيترم/مطبعة الخلود، بغداد | أبو عمرو عثمان بن سعيد الداني/تحقيق: الدكتور غانم قدوري الحمد |
| له□ | هداية المستفيد في أحكام التجويد/دار التربية | الشيخ أبو ريمة محمد المحمود |

# ناوەڕۆك

## بەشی چوارەم

## بەشی پێنجەم

## بەشی وەستان و دەستپێکردن



وصَلِّ اللَّهُم  وَسلِّم عَلى عَبدِكَ وَرَسُولِكَ مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحبِهِ
وسلِّم عَدَدَ مَا ذَكَرَهُ الذّاكِرون وَعَدد ما غَفَلَ عَنهُ الغَافِلُون

# فەرهەنگۆك بە ( عەرەبی - کوردی )

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| اسم الكتاب | تەجویدی شایان بۆ فێربونی قورئان |
| التّجويد | دروست خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز |
| الاستعاذة | أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ |
| البسملة | بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ |
| اللّحن | هەڵە |
| الحرف | پیت |
| الفرعي | لاوەکی |
| المخرج | دەرچە |
| الصِّفة | سیفەت |
| اللّقب | نازناو |
| الحركة | سەروژێر- جوڵە |
| الغنّة | مینگە |
| القلقلة | هەژان |
| الاظهار | ئاشکراکردن |
| الادغام | تێهەڵکێشان |
| الاخفاء | شاردنەوە |
| القلب | هەڵگەڕانەوە |
| لام التعريف | لامی پێناسین |

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| المتجانسين | هاوڕەگەز |
| التّسهيل | ئاسانکردن |
| الامالة | لارکردنەوە |
| النّبر | بەرزکردنەوە |
| الرّوم | ڕەوم |
| الاشمام | ئیشمام |
| الاختلاس | ئیختلاس |
| السّكت | وەستان بەبێ هەناسە |
| الوقف | وەستانی درێژ(بەهەناسە) |
| القطع | وەستان لە خوێندنەوە |
| الشاطبيّة | خوێندنەوە بە ڕێگای ئیمام (القاسم بن فيرُّه الشّاطبي) |
| الطّيبة | خوێندنەوە بە ڕێگای ئیمام (محمد بن يوسف الجزرى) |
| التّيسير | خوێندنەوە بە ڕێگای پەرتوکی (التيسير) ھی أبو عمر الدانى |
| التّكبير | الله اكبر |
| التّمكين | شیاندن |
| اللّازم | لازم |
| الواجب | پێویست |
| الصّلة | گەیاندن |

## نووسەر لە چەند دێڕێکدا




**ناو:** محمدأمین غفار محمد سلیم (أبو أیمن)،

ناسراوە بە (محمدأمین ملا عبد الغفور قدشي).

تر- ڕێپێدراو بە قورئانی پیرۆز بە ڕیوایەتی (حفص )لەئیمام (عاصم).

یر-ڕێپێدراو بەحەوت جۆری خوێندنەوەی قورئان (مجاز بالقراءات السَّبع).

سم- ڕێپێدراو بەزانستی ڕەسمی قورئان (مجاز بعلم رسم المصاحف)

شم- پێشنوێژ و وتارخوێنی.

لھ- بۆ چەندین ساڵ دەبێت مامۆستای تەجوید و قیرائەتەکانی قورئانە لە کەناڵە تەلەڤزیۆنییەکان و رادیۆ و ڕێکخراویەکانی قورئان.

□- هەڵگری بڕوانامەی دبلۆمە لە میکانیك.

Mihamad.amen@gmail.com

محمدأمین. أبوایمن

mohammed__ameen